# باسێك
# لە بنەمای پەروەردە و فێرکردن و کۆمەڵگای پێشکەوتوو

**مەجید کاکەوەیس**



**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **باسێك لە بنەمای پەروەردە و فێرکردن و کۆمەڵگای پێشکەوتوو**
- **نووسینی: مەجید کاکەوەیس**
- **نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی**
- **بەرگ: مراد بەهرامیان**
- **ژمارەی سپاردن: ١٨٢٤**
- **نرخ: ١٥٠٠**
- **چاپی یەکەم ٢٠٠٨**
- **تیراژ: ٧٥٠**
- **چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)**

**زنجیرەی کتێب (٣١٨)**

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

## ناوەڕۆك

## پێشەکی:

دوایین ڕۆژی ساڵی٢٠٠٥ زایینییەو لە بەرامبەر پەنجەرەی ماڵەکەمانەوە دانیشتووم، جار جارە تەماشای ئەو هەموو بەفرە دەکەم کە چەند ڕۆژێکە لە سەر یەک دەبارێ، ئارنگ ئارنگ دێتەخوارێ، لە بارینی بەردەوامەو دەرگای ماڵێ لێگرتووین؛ وا خەریکی نوسینی بەشی کۆتایی پێشەکی ئەم کتێبەم، کە دوایین حەفتەکانی دە ساڵەم لەم وڵاتە چکۆلەی ئەوروپا، وڵاتی " دانمارک" پڕ دەکەمەوە.

پێش ١٠ ساڵ لە پرێکەوە لە نێو دونیای ژیانی دەیان ساڵ پڕ لە چەرمە سەری و کارەسات، لە سیستەمێکی پڕاو پڕ لە نا لەباریو فروفێڵ، سەرە ڕۆییو چەوتو لار، لە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی تاکە کەسی، و دیکتاتۆرانی ناوچەی پڕ لە شەڕو کێشەو ئاژاوە، قەیرانی ماڵیو هەژاری، بە واتای خۆی هەژار، قەدەغەی هەر چەشنە بیرو ڕایەک، یان بۆچونێکی سالم، هتد... هاتمە جیهانێک بە تەواوی پێچەوانەی ئەویترم. لێرەدا بە هەموو شتێک نامۆ بووین، لە هەندێک هەڵس و کەوت و ڕەفتارو ئاکارو بینینێک سەرسام دەبووین و جاروبار نکوڵیمان لێ دەکرد و جێگای شک و گومان بوو بۆمان! مێشکمان وەری نەئەگرت و بۆمان ڕەوان نەبوو، چۆن لە سیستەمێکو قەوارەیەکیتردا را هاتبووین.

چەندین ساڵی برد تا توانیم لێیان حاڵی بم، لەم سیستەمە تێبگەمو تا ڕادەیەک بتوانم خۆم بگونجێنم. لەوانەیە من بۆ خۆم بە پێی ئەو فکرەیەم کە لە نێو سەردەمو بازنەیەکیتردا ڕاهاتووە، لەگەڵ ئەم کۆمەڵەیەدا لە هەندێک بواردا قەت یەک نەگرینەوەو لێیان حاڵی نەبمو پێم هەزم نەکرێت، بەڵام بێگۆمان نەوەی نوێو نوێترمان لە نێو بازنەو  پەروەردەیی ئەم سیستەمە، لەوانەیە ئەو شتانە بە ئاسانی وەربگرنو هیچ کێشەیان نەبێت. لێرەدا هەموو ئەو خاڵە لاوازو بە هێزانەم دەست نیشان نەکردووە کە بۆ خۆم تا ڕادەیەک لێیان تێگە یشتووم، بەڵام هەندێک خاڵی گرنگ هەبوون کە دەبوو سەرنجیان بدرێتێ. لێرەداو لەم بەرهەمە کرچو کاڵەدا کە ماوەی چەند ساڵێکە پێوەی خەریکم، مەبەستم ئەوەیە کە خوێنەر هانبدەم، یان



خوێنەران، مامۆستایان، ڕوشنبیران، ڕاهێنەران، پەروەردەران...، بەئاگا بێنمو هەستیان زیاتر ببزوێنم بۆ چاکسازیو ڕاستکردنەوەی سیستەمی پەروەردەو فێرکردنو ڕاهێنانی منداڵانو بە گشتی گەشە پێدان بە سەلیقەو فکرو هێزو توانای خۆ و کۆمەڵو بەرجەستە کردنیان بەرەو یەکەیەکی شارستانیو ڕوانگەی سەردەم. وەک لە شوێنێتری ئەم کتێبەدا باسم کردووە ڕوانگەو تێڕوانینی بەشێک لە زاناو فەیلەسوفەکانی ڕۆژئاوا لێرەدا لە نێو ئەم باسانەدا ڕەنگیان داوەتەوەو هەریەکەی بەشێک باسم کردوەو نوسیومن، کە زیاتر  ڕوانگەی " جان دەڤید" لێکۆڵەری بواری فەلسەفەی پەروەردەو فێرکردن، کۆڵەکەو بنەمای ئەم کتێبەم بووە.

دیارە فەلسەفەی پەروەردەو فێرکردن تەنیا وانە وتنەوەو کاری نێو قوتابخانە نیە، بەڵکو دەبێ لە هەموو ڕوویەکەوە ماوەی پێ بدرێتو کاری بۆ بکرێت، شارەزایانو پسپۆڕانی بوارە جۆراو جۆرەکانو هەر کام لە لای خۆیو لە جێگای خۆی باس بۆ کۆمەڵو قوتابیو دستەو تاقمەکان بکەنو زانستانە فێرکرێن، بۆ ئەوەی ئێمەش بتوانین خۆمان هاو کێش کەین لە گەڵ دونیای سەردەم و سیستەمی پەروەردەیی باش، وەک ئەو وڵاتانەی کە توانییان لە سەرچاوەی فەلسەفی و زانستی کەڵک وەرگرنو بگەنە ئەم ئاستەی کە ئەمڕۆ سەرنجی ئێمەیان بۆ لای خۆیان ڕاکێشاوە. باسەکان بە گشتی باسێکی گشتگیر و هەمە لایەنن لە بواری فێربوونو فێرکاریو خۆناسین و مرۆڤو سروشتو دیاردەکان.

ئەم هەوڵو کۆششەم هەرچەند دەزانم بێ کەموکوڕی نییە و ناتەواوە، بەڵام تا ئەو ڕادەی پێمکراوە و توانیومە بە زمانێکی سادە و خۆماڵی و بە وشەی ڕەسەنی کوردی، و پاراستنی زاراوە و زمانی کوردی، بە خۆ دوورکەوتنەوە لە وشەی گران و نەپۆڕ و ناکوردی، تا توانیبێتم هەوڵی خۆمم داوە. هیوادارم کە کەسانێکی وا هەبن بە ڕەخنەو تێڕوانین لەم کتێبە، شان بدەنە ژێر ئەرکی گرانتر و لەم بوارانەوە بە پەیڤ و وتار و باس و لێکۆڵینەوەو نووسینی بە پێز، کۆمەڵگاکەمان دەوڵەمەنتر بکەن.

**مەجید کاکە وەیسی**

## دەسپێک

* کۆمەڵی پێشکەوتوو و توێژی رۆشنبیر لە بواری پەروەردە و فێرکردنێکی رەسەن و باو و گشتگیرەوە بەدی دێن و گەشە ئەکەن. بنەمای هەر فێربوون و فێرکارییەکیش بەشێکی هەرە گرنگی ئەگەڕێتەوە بۆ باری خێزانی و ئەو جێگا و کۆمەڵگایەی مرۆڤ، یان بڵێین؛ منداڵی تێدا پەروەردە ئەبێت، کە دایک بە تایبەت رۆڵێکی هەرە سەرەکی هەیە لەو بوارەدا. گەر بمانەوێ نەوە و منداڵانی کۆمەڵگای کورد زوو گەشە بکەن و بچنە ریزی پەروەردەیی جیهانی پێشکەوتوو، ئاستی ڕوشنبیریو گەشە کردنیان بەهێز بێت، چەندین میکانیزم و یاسا هەن کە دەبێ رەچاو بکرێن و بۆیان تەرخان بکرێت: پێش هەموو شت، یاسایەکی رێک و دروست و خزمەتگوزار، یەکسانی، عەدالەتی کۆمەڵایەتی بۆ خوێندن و خوێندکار پێک بێت، شوێنی رێ و رەسم و کۆڕ و کۆبوونەوە و فێرکاری، قوتابخانە و خوێندنی کچان و کوڕان بێ جیاوازی و هاندانیان بەرەو پلەی بەرزی تێگەیشتن. هێنانە کایەی سیستەمێکی ئازاد و دیمۆکراتی و لە هەمان کات سنووردار، لە بواری پلەو پایە و بەند و بارەوە دەڵێم. هەر وەها ئەو سیستەمە دەبێ هەردەم لە نێو گۆڕانکارییەکاندا هۆشیار بێت و لە ئاستی کەڵک وەرگرتن و گەشە سەندندا بێت کە بتوانێت کۆمەڵەکەی بە چرکە و خولەک لە هەموو وقایاو پێشهاتەکانی سروشتی و زانستیو کۆمەڵی ئاگادار بکاتەوە.

تاڕادەیەکی زۆر بنیاتە گشتی و کۆمەڵی و پیشەییەکان بەرفراوان بکات بۆ ئەوەی هەموو لایەکو هەر کام لە بواری خۆیدا بە پێی تواناو ویست و سەلیقە، خۆیان سەرگەرم بکەن و رێبازی خوازراوی بە جێ،



ببیننەوە و بێکاری و بێتاقەتی کەم کەنەوە. بیروڕاو بۆچوون و بڵاوکراوەکان تاڕادەی یاسایی ئازاد بن و یارمەتییان بدرێت تا دەکەونە سەر پێی خۆیان. کۆمەڵ بە گشتی و لاوان بە تایبەت هانبدرێن بۆ خوێندنەوە و بەرزکردنەوەی ئاستی زانیارییان و پێشبڕکێ دانان لە هەموو بوارەکاندا بۆ ئەوەی خەڵک ناچار بێت خۆی فێر بکات و تێکۆشانی بەرفراوانتر بێت لەو بوارانەی کە حەزیان لێی بێ. کتێب و کتێبخانەکان جێگایان زۆرتر و گەورەتر بکرێت و ئامێری پێشکەوتووی تیا بە کار بهێنرێ کە کارئاسانی بێت بۆ خوێنەران و ئەنجامی کارەکانیان. یاریدەری نووسەران و خاوەن بەهرە و قەڵەمەکان، خاوەن هونەر و جوانییەکان، ئەوانەی هەر هەستێکی بە کەڵک و بە پێزیان لایە هاوکاری بکرێن تا دەکەونە سەر رۆڵی بەرهەم هێنانیان. بوژانەوەی ئەو کولتوور و کەلە پوورەی کە زەمەنێکی زۆریان بە سەر چووە و هێشتاش هەر بە کەڵکن بۆ کۆمەڵ. کاتێک کە مرۆڤ یان کۆمەڵگا بەگشتی کار ئاسانی بۆ بکرێتو هەموو لایەک بە هاوکاری سەر بەخۆیی فیکری و تێگەیشتوویی بۆ بەرژەوەندی یەکتری و گشتی کار بکەن، ئەو کات دەتوانین بڵێین کە ئەو کۆمەڵگایە پێشکەوتووە.

لێرەدا من زیاتر رووی قسە و نووسینەکانم لە گەلی کوردە، ئەو گەلانەی کە لە چوار دەوری ئێمەدا دەژین کە بە داخەوە نە ئێمە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت توانیومانە لەو قەیرانە بە تەواوی بێینە دەرێ و نە میللەتانی دەوروبەریشمان ویست و خواستیان لەو بوارەدا هەبووە!. هۆکارەکانیش چی بوو بن، لە ناواخنی ئەم باسانەدا ئاماژەمان پێداون. وەک دەڵێن؛ " ماڵ لە خۆتان کەم بێت و دزیش رووی تێکا"!

ئەگەریش کورد ئەو مایەی تێدا بایە و بیویستایە، دوژمنانی ناوچە و پاوانخوازانی دەسەڵاتدار بە داخەوە نەک هەر نەیان دەهێشت، لە جیاتی سەرکوت و ماڵوێرانی، نەزانی، نیفاق، دوژمنکاری، جیاوازی، سیستەمی

کۆن و بێ کەڵکیان لە نێوماندا پەرە پێدەدا و خەڵکیان لە هەر چەشنە تروسکەیەکی زانست بە دوور رادەگرت، کە تا ئێستاش درێژەی هەیە.!

وەک هەموو لایەک ئاگادارن زۆربەی بازرگانی و سەروەت و سامانی دونیا و بە تایبەت وڵاتانی زلهێز لە هەرێمی گەورەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کە ئێمەش چەند بەشێکین لەو هەرێمانە، دابین دەکرێن. دەتوانم بڵێم سەروەت و داهاتی نەوتی و کانگا و سەرچاوەکانی تری رۆژهەڵاتی ناوین کە دەیان ساڵە دەسەڵاتدارانی گەوج و نەفام و دیکتاتۆرانی ناوچە بە فیتی پاوان خوازان و بۆ مانەوەی دەسەڵاتی پڕ شوم و نەنگینی خۆیان بە فیڕۆی دەدەن.!! دەکرێ بڵێم بەرهەمی ئەو هەموو سەروەت و سامانەی ناوچە و وڵاتەکەمان دەیان ساڵە دۆستی دەرەکیو بێگانەو دوژمنی ناوەکیو خۆماڵی، چرای بووژانەوەی نەیارانو چقڵی چاوی خۆمان بووە. هەروەها ئەو بەرو بوومو سەرچاوە سروشتییانە لە نەزانی و ناهۆشیاری خاوەنەکانیان، زۆر کۆمەڵگای خستووەتە ئاسایش، کە چی خاوەنی سەرەکی ئەو وزە و سەروەتە گەورەی دونیا هێشتا هەر لە شەڕ و ناکۆکی و دژایەتی و لێک تێنەگەیشتن دان. وەک دەڵێن: " ماڵ لە خاوەن ماڵ حەرامە" ماڵی خۆ نەخۆر بۆ چەکمە بۆر". لە هەمووی گرنگتر وڵاتانی زلهێزی ئابووری و رامیاری و پاوان خوازی و سەرمایەدار لەو ناکۆکی و دژایەتییە کەڵکیان وەرگرتووەو لەو رێگایەی کە من هەر بە نا هۆشیاری کۆمەڵی دادەنێم، توانیویانە لەو سەرچاوە گرنگانەی کە ژیانی مرۆڤی پێوە گرێدراوە بەهەشتی بەرینی دونیایی بۆ خۆیان ساز بکەن، لە جیاتی پاداشتی چاکسازی، چەکی کۆمەڵ کوژ و تۆقێنەر و باروت و گولە و بۆمبا و موشەک و مین و زۆر تەقەمەنی تری کۆمەڵ هەژێن بەو گەلانە بدەن، ئەوانیش بە فیتی تاقمێک چاو چنۆکی کورسی و دەسەڵاتی تاکی و پاوان خوازی، هەستن یەکتری پێبکوژن و ماڵوێرانی و کاولکاری بە دیاری بۆ



خۆیان بێنن، کە زۆربەمان شایەتی ئەو حاڵەتە بووین و بە داخەوە ئێستاش درێژەی هەیە.

هەر چەند دڵنیام کە گۆڕانکاری گشتی لە ئارادایە و وا خەریکە لەو قەیرانانە رزگار بین، بەڵام دیسان هۆشیاری پتری دەوێ. دیارە ئەمە ناگەڕێتەوە سەر ئەوەی کە ئێمە تەنیا لایەنی دەرەکی تاوانبار بکەین، بە باوەڕی من ئەوان هەر جۆرێک بۆ خۆیان لێکی بدەنەوە بە ئاگا و هۆشیارن لە پلانەکانیان، زیاتر کۆمەڵی خۆمان بە تاوانباری سەرەکی دەزانم. هەر بۆیە بە راستی هەموو ئەو شتانەی کە لێرەدا باس کران چەند بەشێکن لەو گیروگرفت و نالەبارییانە. دەبێ بڵێم کە هەتا ئێمە بۆ خۆمان هەوڵ نەدەین و بنەما و بناغەیەکی پەروەردە و فێرکردنی دروست و زانستییانە و سەردەم بۆ کۆمەڵگەمان بە گشتی ساز نەکەین و هزرو بیرو هۆش نەخەینە کار، سەربەخۆیی فکریمان نەبێت، قەت لەو قەیرانانە رزگاریمان نابێت.

پێش هەموو شت بۆ هەر تێکۆشانێک، میللەت دەبێ هۆشیار بێت و بە ئاگاییەوە دەنگ و رەنگی خۆی هەڵبژێت، هەر تاکێک لە کۆمەڵدا خاوەن سەربەخۆیی فیکری بێت و خۆی بڕیاردەر بێت، بەرژەوەندی خۆی و کۆمەڵگای پێکەوە گرێ بدات و بزانێت گرنگییەکەی لە کوێدایە، جا ئەو کات ئەتوانین بڵێین کۆمەڵگای ئێمەش گەشەی کردووە.

ئاستی رۆشنبیری زۆر بەرفراوانە و مرۆڤ خۆی تێدا دەبینێتەوە. مەرجیش نییە کە هەر خوێندەوارێک رۆشنبیر بێت، یان هەر نەخوێندەوارێک نا رۆشنبیر! تا ئەم قۆناغەی ئێمە لە هەردوو بەشەکەیدا هەم رۆشنبیر و هەم پێچەوانەکەی هەیە.

نەخوێندەواری وامان هەیە لە ئاستی رۆشنبیرێکدا خۆی دەبینێتەوە و لە یەکێک لە بوارەکانی کۆمەڵگادا خزمەت دەکات و کار و تێکۆشانی خۆی لە بەرژەوەندی گەل و نیشتیماندا جێ بەجێ دەکات. لەم لاوە

خوێندەواری واشمان هەیە کە نەک هەر رۆشنبیر نییە و فرِی بە لاوە نییە و بێسودە، بگرە زیان و زەرەریشی زۆرە و دەبێتە خێو و کرم و خۆرکە لە نێو کۆمەڵەکەیدا. هەر بۆیە بەڕاستی کۆڕ و کۆبوونەوە و پەروەردە و فێرکـردن و راهێنـان بـە واتـای دروسـتی خـۆی رۆڵـی کاریگەری هەیە لەو بوارانەدا.

بە شێوەیەکی گشتی دەبێ سیستەمێکی وا پێک بێت بۆ خزمەت بە گەلو کۆمەڵ، هەروەها دەبێ گەل و کۆمەڵ هاوکار و گوێڕایەڵی ئەو یاسایە بێت و پێڕەوی یەکتر بن، بە هاوکاری یەکتری دەتوانن گەشەو پێشکەوتن مسۆگەرتر بکەن. مرۆڤی فێرکراو و راهاتوو زوو هەست بە گۆڕانکارییەکان دەکات و خۆ لەگەڵ ڕەوتەکاندا دەگونجێنێت.

تاک، واتە تاکی کۆمەڵ کە مایەی گەشەکردنی تێدا بێت و بە شوێن زانستدا بگەڕێت، دەبێ زۆر زوو ویستەکانی بخرێتە قۆناغی جێ بەجێ کردن و یارمەتی بدرێت لەو بوارە بە سوودانەی کە لە بیر و هزری دایە، چونکە بەڕاستی تاکی کۆمەڵ کاریگەری زۆری هەیە لە سەر گۆڕان و ئاڵوگۆڕ پێکهێنان لە وڵات و تەنانەت لە دونیاشدا.

واتە تاک دەتوانێت بە چرکەیەک، وتەیەک، بڕیارێک، بیرۆکەیەک، ئاڵوگۆڕی قوول لە جیهاندا پێک بێنێت، چ ئەو گۆڕانە 'پۆزەتیڤ یان نیگەتیڤ بێت'، واتە خێر یان شەڕ بێت.

نموونەکانیش؛ ئەو هەموو گۆڕانکارییە خێرایانەیە کە لە لایەن تاک و زلهێزێکەوە بڕیاری لێدراوە و سەری هەموو دونیای پێوە خەڕێک کردووە و تێکڕا سەرنجی پێدراوە، کە لەو بەینەدا لایەنێک ون ئەبێت و لایەنێک زیندوو ئەبێتەوە. ئێمەش هیوامان وایە کە لەم قۆناغەیدا خێر ببینین، ئەمجارەیان لە زیندووەکان بین نەک لە مردووەکان.

بۆ ئەم گۆڕان و دەسکەوتە گەورەیە دەبێ لە پێشدا لە ماڵ و خێزانەوە دەس پێبکات و هاندەری هەمە لایەنەی یەکتری بین بۆ



سەقامگیر کردنی کۆمەڵێکی تێگەیشتوو و پێگەیشتوو. کۆمەڵ کە بە شێوەی پێویست پەروەردە کرا، ئەو جار دەتوانین بڵێین دیموکراسی هاتووەتە کایەوە و دەپارێزرێ. تا کاتێک گەل لە واتای وڵاتپارێزی و دیموکراتییەت تێ نەگات، ناتوانین بڵێین دیموکراتییەت لەو شوێنەدا هەیە و سەقامگیرە. سیستەمی پەروەردە و فێرکردن بە شێوەی زانستی کۆمەڵناسی و سەردەم بۆ خۆی بەشێک لە دیموکراتییەت دەستەبەر دەکات. بۆ سەلماندنی ئەم راستییانە نموونەی بەرچاومان زۆرە لە وڵاتانی دونیا بە گشتی و ئەوروپا و رۆژئاوا بە تایبەت.

هەر وەک باسم کرد هەندێک لە شتەکان، 'داب و نەریتەکان' و تەنانەت ئەو ڕووە پەروەردەییەی کە ئێستا بووەتە بەشێک لە کلتووریان، دەقاودەق وەرناگرم، لە ڕوانگەی خۆمەوە بە باشیان نازانم. تەنانەت زانایانی خۆشیان لە هەندێک بوارەوە زۆر بە گلەیی و گازاندەن لە کۆمەڵەکەیان و بۆچوونیان وایە کە لەو ئاستانەیەوە بەرەو ئاراستەی خراپ دەڕۆن. سەرەڕای ئەوەش، هێشتا قازانجی لە زیانی پترە و پێم باشە تەنیا لێرە باس لە سیستەمی پەروەردە و فێرکردن و هەندێک بەرهەمی دیموکراسیو ئەم کۆمەڵە پێشکەوتووە بە نموونە بێنمەوە.

کاتێک کە دەبینم گەشەی منداڵ و پەروەردە و راهێنان چەندە لێرە لەم وڵاتە بەتایبەتی و ئەوروپا بە گشتی لە چ ئاستێکدایە، ئینجا دەچمەوە نێو دونیایەک خەیاڵ و پرسیار و وڕێنە؛ بە ناو گەل و وڵات و سیستەمی پەروەردەیی ئەو وڵاتانەی کە وڵاتی کوردیان تێدا دابەش کراوە، لە هەمووی خراپتر ئەو سیستەمە ئیفلیجەی کە لە ناوچە کوردییەکاندا بەڕێوە چووە و دەچێ و بووەتە باو، زیاتر باری مێشک و شانم قورستر دەبێت و پتر هەست بەو زوڵم و نا بەرابەرییە دەکەم!.

کاتێک لێرە لە شوێنە گشتییەکانی ئەم وڵاتە وەک؛ قوتابخانە، باخچەی ساوایان، نەخۆشخانە، نێو پاس و شەمەندەفەر...، لە ڕێگا و لە

کاتی پشوو و له نێو ماڵ، شەو و ڕۆژ بەردەوام لە هەموو ڕوویەکەوە لە خزمەت خۆ و وڵات و نیشتمان و بە تایبەت منداڵانن، بە هەر شێوەیەک بۆیان بکرێت و پێیان بکرێت فێری پەیڤ و وت و وێژ و زانست و زانیاری و یاسایان دەکەن. کاتێک باوکان و زیاتر دایکان  و ئافرەتان لە هەر شوێن و جێگایەک بۆیان بکرێ و بۆیان بگونجێ، چیرۆک و داستان و وێنەی جۆراوجۆر و ڕەنگی و جۆرەها وێنەی ئاژەڵ و پەلەوەر و بە گشتی گیانلەبەران، دەخەنە زەینی منداڵان و فێریان دەکەن. یان نووسین و وێنەکێشان بە قەڵەمداری ڕەنگی لە زۆربەی شوێنە گشتییەکان دانراون و بە خۆڕایی لە بەردەست دان و منداڵان فێر دەکەن و بێزاری خۆیانی پێ دەردەکەن، تەواوی ئەو شوێنانە پڕن لە ئامێر و کەرەسەی فێرکاری و یان لە تەنیشت خۆیانەوە بونەتە تێشووی ڕێگایان، ئینجا دەزانم کە مەوداکان چەندە!

دیارە باوک و دایکانیش لەو بوارانەوە خۆیان سەردەمێک بەشدار بوون و تاڕادەیەکی زۆر بەو شێوە ڕاهاتوون، بۆیە بە سانایی و بە چاکی ئەو ڕەوتە دەپێون و منداڵانیان فێردەکەن. منداڵەکانیان بە چیرۆک و داستانەکانی "هوسی ئانارسێن ی – H.C.A " بە ناوبانگی دانیمارکی و دەیان و بگرە سەدان داستان و چیرۆک نووسانی بە ناو بانگی ڕۆژئاوا و وڵاتانی تری دوور دەلاوێننەوە بە دەنگی ئارام و لە سەرەخۆ و هێمن، بە جۆرێکی زانستانە و فێرگەیی، شارەزا لە خوێندنەوە و وتنەوە و دەستەواژە بە کار هێنان، بە شێوەیەکی سادەو ساکار و منداڵانە، بە ڕەنگو شێوەو تێکستو وشە و  ڕستە و باس و نواندن، لە پێش ڕوو و چاوی منالان و بە ئارامی، مێشکیان ئامادە دەکەن بۆ وەرگرتن، بەو شێوانە ژیریان دەکەنەوە و دەیانخەوێنن، کە ئەمانە پلانی بەردەوام و هەمیشەییانە. ئەو زمانەی کە بۆ منداڵان بە کاری دەهێنن تەنانەت هەر لە سەرەتای پێچە و لانکەوە تا کاتی لاوی و دواتر، وشەی سەردەم و



کتێب و زمانی ستانداردە. واتە جیاوازی ئەوتۆ نابینرێ لە نێوان بە کار هێنانی پەیڤ و گفتوگۆی نێوان دوو گەورە ساڵە و دوو منداڵ، یان گەورە و منداڵێک، یان بە پێچەوانەوە.

پەروەردە و فێرکردن لەم کۆمەڵگایەی کە ئێستا ئێمە تیایدا دەژین و هەر ڕۆژە خۆمان و منداڵانمان پێیەوە سەرقاڵین، وای لێهاتووە کە سیستەمی پەروەردەیی نێو ماڵ و بنەماڵە وەک پەروەردە و فێرکردنی گشتیو یاساییو پێشکەوتوو لێک گرێ دراون و لە یەک ئەچن. مرۆڤ و پەروەردە و فێرکردن لێرە و لەم کۆمەڵگەدا زۆر گەشەی کردووە و بە ڕادەیەک لەگەڵ سیستەمی پەروەردەیی نێو کۆمەڵگاکانی ئێمە و تەنانەت ئەو بازنە ئاماژە پێکراوەی کە پێی دەڵێن ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، تا ئەم کاتەش هێشتا مەودای زۆریان هەیە.

تەنیا نموونەیەکی بچووک لێرە لە نێو قوتابخانە سەرەتاییەکان؛ ئەوەندە هۆکار و ئامێر و ئامرازی پێشکەوتوو و فێرکاری و کۆمپیوتەری زۆر و فراوانن، کە دەتوانم بڵێم لەگەڵ قۆناغە بەرزەکان و شوێنە ئەکادیمییەکانی وڵاتانی خۆمان هێشتا بەراورد ناکرێن، کە بە ڕاستی ئەمە یەکێک لە کێشە هەرە بنەڕەتییەکانی نێو قوتابخانە و فێرگەکانە.....

## بەشی یەکەم:

**١- یەکێک لە پێویستییە گرنگەکانی بنەمای ڕەوتی ژیان، پەروەردە و فێرکردنە:**

نوێسازی و پەرەپێدانی ژیان، بە هۆی گواستنەوەی پاشماوە و میراتی پێشینان و باپیرانمانە کە دەست بە دەست و نەوە بە نەوە هێنراوە و دەچێت. بەرچاوترین جیاوازی نێوان بوونەوەری گیانلەبەر و بێ گیان ئەوەیە، کە گیانلەبەران بەردەوام خۆیان ساز و نوێ و پارێزراو ڕادەگرن. بەڵام بێ گیانەکان وەها نین، بۆ نموونە: کاتێک لە بەردێک ئەدەین ڕووبەڕووی دژکردەوەیەک دەبینەوە ئەگەر ئەو بەرەنگارییە لە هێزی لێدانەکە زیاتربێ! ئەوا گۆڕانێک لەڕووی دەرەکی ئەو بەردە دەرناکەوێت، بەڵام ئەگەر هێزی لێدەر لە خۆڕاگری بەردەکە زۆرتر بێ! ئەوا ئەو بەردە ورد و خاش ئەبێ، بەو واتایە بەرد ناتوانێت لە بەرامبەر هێزێکدا خۆی بپارێزێت و بە قازانجی خۆی دژکردەوە بنوێنێ.

بوونەوەری گیانلەبەر گەرچی بە ئاسانی دەکەوێتە بەر کاریگەری ئەو هێزە دەرەکییە، بەڵام سەر لە نوێ هەوڵ ئەدات تا تواناو وزە بەربەستەکان بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و لە ڕەوتی ژیاندا کەڵکیان لێ وەربگرێت، لە حاڵێکدا ئەگەر ئەو توانایەشی نەبوو، هەرگیز وەک ئەو پارچە بەردە تێک ناشکێ، بەڵکو و بە پێچەوانەوە تێدەکۆشێ ئەو هۆکارە ڕێگرانە لە بەردەم خۆیدا بە شێوەیەک لە نێو بەرێ.

بوونەوەرێکی گیانلەبەر لە نێوان ڕەوتی ژیانیدا، هەوڵ ئەدا بۆ سەرکەوتن و مانەوەی خۆی لەو وزانەی دەوروبەری کەڵک وەرگرێت.



بۆیە لە هەوا و تیشک و تەڕی و وشکی، لە جۆری پێداویستی خواردن و خۆراک بە قازانجی خۆی سوودیان لێ وەردەگرێت. تا کاتێک کە بوونەوەری گیانلەبەر لە گەشە کردندایە دەتوانێت زیاتر لەوەی لەرێی ڕاکێشانی کەرەسەی دەرەکیدا سەرفی ئەکات کەڵک و قازانجی لێ وەربگرێت و بیانخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

"مانای گەشە هەر ئەوەیە ." بوونی گیانلەبەر وجودێکە بۆ زیاترمانەوەی خۆی، لەجیاتی ئەوەی وزەکانی دەوروبەری لە نێو بەرێ، دەیانخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. بەم جۆرە ژیان ڕەوتێکە بۆ نوێکردنەوە و تازە بوونەوە بە هۆی گۆڕانی ژینگەوە.

لە جیهانی گیانلەبەرانی گەورە و فراواندا ڕەوتی نوێ و نوێسازی تاک و کۆ بێ کۆتایی نییە. هەر گیانلەبەرێکی گەورە لە دوای ماوەیەک لە هەوڵی نوێبوونەوە و تازەکردنەوەدا پیر و و ماندوو دەبێ و دەمرێ. مرۆڤیش سنوورێکی دیاری کراوی هەیە و ناتوانێت لەو کاتە زیاتر ئەو ڕەوتە درێژە پێ بدات. درێژەی کاروانی ڕەوتی ژیان نەبەستراوە بە ژیانی مرۆڤێکەوە. مرۆڤ دەمرێت، بەڵام بە هۆی زاوزێ هاوشێوەوە درێژەدان و ڕەوتی نەسڵ و نەوە بەرجەستە ئەکات و دەچێتە پێش.

بەم وتەیە، هەر وەک چۆن شوێنەوارناسانو زەویناسان ئاشکرایان کردووە، بە شێوەیەک هەرجارەو نەسڵێک لە مرۆڤەکان لە ناو چوون و نەوەی خۆیان بە جۆرێکیتر داوە و ڕەوتی ژیانیان بە هەموو پێچ و خەمەکانی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ درێژە پێداوە. جۆرێک لە نێو دەچێ و تەمەنی کۆتایی پێدێ و جێگای خۆی دەدا بە جۆرێکی تازەتر و باشتر، بە پێچەوانەی پێشوو کە توانای لە ناو بردنی ئەو هۆکارە ڕێگرانەی دەوروبەریان نەبوون، زۆر سەرکەوتوانە لەگەڵ دژەکان بەرەنگار دەبێتەوە.

ڕەوتی ژیان بریتییە لە (ئۆرگانیستەکان) واتە پێکهاتەی جەستەی گیانلەبەر، بەردەوام ژینگە و پێداویستییەکانی پێکەوە دەگۆنجێنێ. تا ئێستا وشەی (ژیان) مان، بە مانایەکی زۆر بێ بایەخ کە هەمان ژینی جەستەییە، لێکداوەتەوە. بەڵام ئەم وشە مانایەکی زۆر بەربڵاوی هەیە و تەواوی تاقیکارییە مرۆیی و ڕەگەزییەکان لە خۆ دەگرێت.

وشەی (ژیان) ئەبەستینەوە بە هەموو شێوە و بیرو باوەڕ و سەرکەوتن و تێکشکان و گەشتوگوزار و کار و سەرگەرمییەکان. ئێمە وشەی (ئەزموونیش) وەک "ژیان" لە واتایەکی زۆر بەریندا بەکار دەبەین. ئەزموونی مرۆڤ وەک ژیانی جەستەیی پەیوەستە بە بنەمای تازە و نوێکردنەوە و بەردەوامی. سەبارەت بەمرۆڤ، هەر وەک چۆن لەڕووی جەستەییەوە نوێ دەبێتەوە، هەرواش ئەزموونەکان، واتە بیر و باوەڕ و هیوا و ئامانج، بەختەوەری و چەرمەسەری و ڕێ و ڕەسمەکانیش بەردەوام نۆژەن و زیندوو دەبنەوە.  بەردەوامی ئەزموون کە بە هۆی نوێبوونەوە و نوێسازی ژیانی کۆمەڵایەتی، ڕەنگ دەگرێت، دیاردەیەکی سەلمێندراوە. پەروەردە و فێرکردن بە واتای فراوانی خۆی، ئامرازی سەلماندنی بەردەوامی کۆمەڵگایە. هەر یەک لە ئەندامانی کۆمەڵێک چ لە شارێکی گەورە و نوێ چ لە بنەماڵەیەکی (کێویلەیی) ناشارستانی کرچ و کاڵ و بێ هێز و بێ زمان و بیر و باوەڕ، لە یەک هاوپلەی کۆمەڵایەتی لە دایک دەبێ.

مرۆڤ کە لە پلەی یەکەمدا بوونەوەرێکی گرنگە و پێشڕەوی کۆمەڵ و هەڵگری ئەزموون و ژیانی کۆمەڵگایە، بە نۆرەی خۆی تەمەنێک دەژێت و پاشان دەڕوات و هەواری بە دەستی پاشماوەی دەسپێرێ. بەم شێوەیە سەرەڕای سەربەست بوونی ژیانی تاکەکەسی و دوا هاتنی، بەڵام ژیانی کۆمەڵگا پارێزراوە و لە ڕەوتی خۆیدایە. ژیان و مردنی ئەندامانی کۆمەڵگا دیاردەیەکی حاشا هەڵنەگرو سروشتییە. هەر ئەو ڕەوتەیە پەروەردە و



فێرکردن دێنێتەبوون. لە بەرامبەردا ئەو تاقمە لە ئاو دەرهاتوو و پێگەیشتووەن، کە هەڵگری زانستەکان و شێوە و کۆنن. ئەو نەوەی کە بە نوێنەری داهاتووی ئەو کۆمەڵە دێتە ئەژمار، کە نەک تەنیا لەڕووی جەستەییەوە دەپارێزرێن، بەڵکو لە ویست و خواست و ئامانج زانیاری و توانایی‌و ڕێ‌و شوێن ئەندامانی بە تەمەن و گەورەی ئەو دەستەیە ئاگادار ئەبن، دەنا ژیانی سەربەخۆی ئەو تاقم و دەستەیە کۆتایی پێدێت. گەر نەوەی تازە پێگەیشتووی"دەستە" یان کۆمەڵێک لە بنەماڵەیەکی دەشتەکی، یان تەنانەت شارستانی بە حاڵی خۆیانەوە لێگەڕێن، هیچ کاتێک ناتوانن لەگەڵ ڕێوڕەسمی پڕ پێچ و خەمی ژیانی ئەندامانی دەستەیەکی ڕاهاتوو و پێگەیشتوو هاوڕێ بن. هەرچەند تەمەنی شارستانی و گەشەکردن بچێتە پێش، جیاوازی زۆرتر لە نێوان سەلیقە و توانای کۆمەڵی بە ئەزموون و لە ئاو دەرهاتوو و دەستەی کەم ئەزموون و نوێکار دەردەکەوێ. بۆ نوێ بوونەوە و بەردەوامی ژیانی کۆمەڵایەتی تەنیا گەشەی جەستەیی و زاڵ بە سەر پێویستییە سەرەتاییەکانی بەس نین.

بێجگە لە مانە پێویستە هەرکەسێ کەموکوڕی و پێویستییەکانی کۆمەڵگا تێبگات و هەوڵی زانستی بۆ بدات. ئەو ئەندام و تاقم و دەستە تازەکار و ناشارەزایانەی کە سەبارەت بە ئامانج و کردەوەی تاقمی پێش خۆیان نەزان و بێ مەیلن و هۆکارەکان ناناسن، تەنیا ڕێگای ڕزگاری لەو ناهۆشیارییە، ڕێگای پەروەردە و فێرکردنە.  ڕەوتی ژیانی مرۆڤ و درێژ بوونەوەی بە بێ تێکەڵاوی و پەیوەندی جەستەیی و بڵاو کردنەوەی میراتە کۆمەڵایەتییەکان، ناڕوات و بە ئامانج ناگات. ئەم بڵاوکردنەوە و درێژەدانەی ڕەوتی دەسکەوتە کۆمەڵییەکان لەڕێگای پەرە پێدانی کردەوە زانستی و سۆزدارییەکان نەسڵی بە ساڵاچوو بۆ نەوەی لاو جێ بەجێ دەبێ و فێر دەکرێت. ئەگەر ئامانج و هیوا و چاوەڕوانی‌و خەت و ڕێباز و بیر و باوەڕگەلی کەسانێک کە بەرەو پیری

مەرگ دەڕۆن، وەرنەگرینو بە لاوانی پێگەشتووی کۆمەڵگای نەسپێرین، ئەو ژیانە کۆمەڵایەتییە بەردەوام نابێت.

بۆ نموونە ئەگەر تەمەن هەتا هەتایی بوایە، پەروەردە و فێرکردنی لاوان لەوانەیە کارێکی پێویستی نەبوایە، بەڵام لەم دونیا زوو گوزەرەی تەمەندا، پەروەردەی منداڵان ئەرکێکی بەجێ و پێویستە و دەبێ هەبێت. نوێسازی کۆمەڵگاش کارێکی خۆڕسکی نییە، دەبێ کۆمەڵ هەوڵی بۆ بدات تا تەوژمی راسپاردن و جێبەجێ کردن و دیاردەی میراتە کۆمەڵایەتییەکان بە شێوەی تەواو دروست و کامڵ هەوێن بگرێت، ئەگەرنا، شارستانیترین کۆمەڵگا بەزووترین کات ئەگەڕێتەوە بۆ دەورانی بەربەرێتی و نەزانی. لەڕاستیدا نەوە و زادەی مرۆڤ هێندە نەپۆڕ و ناپوختە و بێ توانایە، ئەگەر لە یارمەتی و پارێزگاری گەورەکان بێبەش کرێن، بێشک لە ئەستۆی فێربوونی سەرەتاییترین پێویستییەکانی لەشیش دەرنایەن. بەچکەی مرۆڤ لەڕووی ئامادەگی و توانایی جەستەیی خۆیەوە لە بێچووی باقی گیانلەبەران دواکەوتووترە، دەبێ لەڕووی جەستەییەوە ژیانی بپارێزرێتو لەڕێگای گەورەکانەوە فێر بێت، تا دەگاتە شێوەکاری هونەری و زانستی و ئەخلاقی و مرۆڤایەتی، کە پڕن لە هەوراز و نشێو، کاتی زیاتری دەوێت بۆ راهێنانیان.

**٢- پەروەردە و فێرکردن و پەیوەندی کۆمەڵایەتی:**

مەبەستی لە رەوتی پەروەردە و فێر کردن ئەوەندە گرنگ و بێ ئەملاوئەولایە کە پێویستمان بە باس کردن لە سەری نییە. ناتوانین لەوە گومانمان هەبێت کە ناوەندی فێرگە یەکێک لە ئامرازە گرنگەکانە، کە مرۆڤی لاسار ئەخاتە چوارچێوەی یاساوە. بەڵام دەبێ بزانین کە ئامرازگەلێکی دیکەی فێرکردن هەیە، یەک لە دوای یەک لە رەوشی فێرکردنی قوتابخانەکان کاریگەرترن. بە شێوەیەکی گشتی بۆ لێکدانەوەی



بایەخی فێرکردن لە فێرگەکان، دەبێ مەودایەکی پان و بەرین کە بریتییە لە پەروەردە و فێرکردنە سەربەخۆ و نارەسمییەکان بخەینە بەر باس و لێکدانەوە. ئاڵوگۆڕ و پەیوەندی نەک تەنیا ژیانی کۆمەڵگا درێژ دەکاتەوە و بەرەو پێش دەبات، بەڵکو ئەتوانین بڵێین کە بوونی کۆمەڵگا بەستراوەتەوە بە ئاڵوگۆڕ و پەیوەندی بواری رۆحی هاوکاری و هاوبەشی کۆمەڵ. مرۆڤەکان بە بوونی ئەو هاوبەشییەی کە هەیانە، رەوتی کۆمەڵگا درێژە پێدەدەن، هەروەها بە هۆی ئەو پەیوەندییەیە کە بوونەتە خاوەنی ئەم بوونە هاوبەشە.

ئەو خاڵە هاوبەشانەی کە کۆمەڵ یان کۆمەڵگا دێنێتەبوون، بریتییە لە ئامانج و بیروباوەڕ و ئاوات و زانستە هاوبەشەکان، یان بە وتەی کۆمەڵناسەکان" وەک یەک بیرکردنەوە لەخۆ دەگرێت". ئەم خاڵە هاوبەشانە هەروەها ناتوانین بە ئاسانی وەک خشت و ئاجوڕ دەس بە دەس بدەین یان وەک کاڵەک و شوتی قاژ قاژی کەین و بە هەر کەسێک بەشێک بدەین. بۆ ئەوەی بوون و پەیوەندی هاوبەش لە نێوان مرۆڤەکاندا بێتە ئاراوە، دەبێ ئارەزوو و ویستی عەقڵی و عاتیفی، بێ پەردە و بەڕوونی، لە کۆمەڵگادا هەبێت و مرۆڤەکان هان بدات تا بۆ ویست و خواستەکانی خۆیان بکەونە پێشبڕکێ و دژکردەوەی هاوشێوە.

نزیکایەتی شوێن و جێگای کۆمەڵێک، نابێتە هۆی دروست بوونی کۆمەڵگا، هەروەها مەودای دوورکەوتنەوەی لە یەکتری ناتوانێت کاریگەر بوونی پەیوەندی نێوانیان لە نێو بەرێت. لەوانەیە کەسانێک کە هەزاران فەرسەق لە یەکتری دوورن، تەنیا بە هۆی نامەیەکەوە (نووسین یان تەلەفون) بە رادەیەک لە یەک نێزیک ببنەوە و ببنە هاوڕێ و هاودڵ کە لە رادەی دۆستایەتیدا لە کۆمەڵێک هاوماڵی لێک نزیک زۆر زیاتر بێت.

بەڵام کۆمەڵێک مرۆڤ کە نەزانانە بۆ ئامانجێکی هاوبەش کار ئەکەن، وەک گرووپێکی کۆمەڵایەتی نایەنە ئەژمار، هەروەک چۆن پارچەکانی

ماشینێک ئەگەر چی هەموویان پێکەوە بەوپەڕی هاوکارییەوە بۆ ئامانجێکی هاوبەش کار ئەکەن، بەڵام کۆمەڵگایەک دروست ناکەن. تەنیا ئەگەر تەواوی مرۆڤە هاوکارەکان سەبارەت بە ئامانجی هاوبەشی خۆیان هۆشیار و یەک دەست و دڵ بن لە ئەنجامدا هەرکام هەوڵ و تێکۆشانی تایبەت بەخۆیان بۆ ئەو ئامانجە ڕێک بخەن، کۆمەڵگا دروست دەبێت، ئەمەش بە بێ پەیوەندی دەس نادات. هەر ئەندامێک دەبێ لە بارودۆخی ئەویتر ئاگاداری بێت بۆ ئاگادارکردنەوەی کەسانیتر لە چۆن و چلۆنیان، ئامراز و بواریان هەبێت.

پێکەوە گونجان دەسکەوتی پەیوەندییە، هەر بۆیە دەبێ بڵێم کە هەموو پەیوەندییەکی دەستەیی نابێ بە پەیوەندی کۆمەڵایەتی دابنێین. زۆر ئەندامانی دەستەیەک لە پەیوەندی ئامێرەکانی ترۆمبیلێک دەچن. بۆ نموونە زۆرن ئەوانەی بە بێ ڕێزگرتن و سەرنج دان بە مەیل و ویستە هۆشیو عاتیفییەکان و بێ ڕەزامەندی، زۆر کەس دەخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە و کاریان لێ دەکێشن. ئەو جۆرە کارلێ کێشانە بێ شک دیاردەیەکی زاڵ بوونە، وەک جەستەیی یان زاڵ بوون بە سەر پلە و پایە و پیشە و زانست، یان ماڵ و سەروەت و  سامان، یان ئامێر و ئامرازەکانی ماشێنی و کارگەیە.

ئەگەر پەیوەندییەکانی نێوان باوک و دایک و منداڵ، مامۆستا و قوتابی، فەرمانکار و فەرمانبەر، حکوومەت و جەماوەر لەم ڕووەوە گەشە نەکات و جیاواز نەبێت، دەبێ بڵێین کە پەیوەندییان، تەنانەت ئەگەر چەند شێوازی و نزیکیش بن، دیسان بنەمای پەیوەندییە کۆمەڵییەکان نین و نایەنە خانەیەکەوە. هەڵبەتە بڕیاردان و بەڕێوە بردن لە کارو کردەوەی مرۆڤەکان و دەسکەوتی ئەو کارانە، کاریگەری دادەنێت، بەڵام بۆ دروست کردن و بەدیهێنانی ئامانجە هاوبەشەکانی کۆمەڵایەتی و پێکەوە گرێدانیان تەنیا بە پێخۆشبوونی تاکەکان بەس نینە، ژیانی



کۆمەڵایەتی خۆی بۆ خۆی پەیوەندییە و هەر جۆرە گرێدانێک لەم بوارەدا، وەک هەموو دیاردەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی، هۆکارێکی فێرکردنە.

کاتێک کەسێک لەڕێگای پەیوەندییەوە لە کەسێکی تر شتێک فێر دەبێت، ڕووبەڕووی ئەزموونێکی نوێ دەبێتەوە و ئەزموونەکانی پێشووی خۆی ڕاست و ڕێک دەکات. کەسێک کە تێکەڵاوی فیکر یان عاتیفەی کەسانیتر دەبێت، کەم و زۆر ئاڵوگۆڕی بە سەردا دێت. هەروەها لایەنێکی تری پەیوەندی هەرئەوەیە بە نۆبەی خۆی دەگۆڕدرێت. کاتێک تۆ یەکێک لە ئەزموونەکانی خۆت، بە تایبەت ئەو ئەزموونانەی کە تاڕادەیەک پێچ و پلۆچن، بە شێنەیی و پاک و ڕاست بۆ کەسانیتر باس دەکەیت و دەیخەیتە مێشکیانەوە، بتەوێ و نەتەوێ نەزەر و لێکۆڵینەوەیەکی نوێتان نیسبەت بەو ئەزموونە دڵخوازەی خۆت بە دەست هێناوە. ئەگەر بەو شێوەیە نەبێت دیارە نەتتوانیوە ئەزموونی دڵخوازی خۆت بە کەسانیتر بسپێری، و جێبەجێی بکەن.

کاتێک کە دەتەوێ تاقیکردنەوەیەک فێری کەسانی تر بکەیت، دەبێ لە پێشدا ئەو ئەزموونەت بە شێوەیەکی پوخت و شیاوی وتن بخەیتە قاڵبەوە، ئەم کارەت وا پیشان دەدات کە لەڕووی کەسایەتی و تایبەتمەندی ئەزموونەکەتدا چاوپۆشی بکەیت و هەوڵ بدەیت تا لەچاوی لایەنێکەوە بۆی بچیت و تێبڕوانیت و بزانیت کە لەگەڵ ژیانی ئەودا چ پەیوەندییەکی هەیە. بەم جۆرە دەتوانیت ویستی خۆت بەجۆرێک دەرخەیت کە بۆ لایەنەکەت پڕ مانا و بەجێ بێت. هەروەها دەبێ پەیوەندی مرۆیی وەک پەیوەندی "هونەر و هونەرویست" ڕەچاو بکرێت. دووەم، دەبێ بڕواشت بەوە هەبێت کە هەر جۆرە تێکۆشانێک کە لایەنی کۆمەڵایەتی و هەمە لایەنی هەبێت، بۆ هەموو ئەوانەی کە بەوەوە پەیوەستن، بە هۆکارێکی بارهێنان و فێرکردن دێنە ئەژمار.

له ئەنجامدا، نه تەنیا ژیانی کۆمەڵایەتی بۆ بەردەوامی خۆت، زانست و فێربوون دێنێتەبوون، بەڵکو ڕەوتی ژیانی کۆمەڵایەتی سەرانسەر هۆکارێکی ڕاهێنانە، ئەزموونەکانی تاکەکەسیش پڕ نرخ و گران دەکات، بیر و هەست دەجوڵێنێ کە ناچار بێت تیشک بخاتە سەر فیکر و وتە و پەندەکانی.

مرۆڤێک کە بەڕاستی لە تەنیاییدا بژیت و هیچ جۆرە پەیوەندییەکی ڕوون و ناڕوونی لەگەڵ کەسانیتر نەبێت، بۆ بیرکردنەوە لە سەر ئەزموونەکانی رابردووی خۆی و دۆزینەوەی بنەمایان، یان قەت بۆی نالوێ و ناتوانێت یان تەنیا ئیمکانێکی زۆر کەمی بۆ دەگونجێت. جیاوازی و نابەرامبەری ئەزموونگەلی مرۆڤی تازەکار و مرۆڤی کارامە و پێگەیشتووی کۆمەڵگا دەبێتە هۆکارێک کە ئەو کۆمەڵگا ڕووبەڕووی فێر کردنی نەسڵی نوێ بێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە ئەزموونەکان وا ڕێکوپێک و لە قاڵب دەدات کە بە سادەترین شێوە و چاکترین ڕێگا بۆ نەوەی نوێ بگوازێتەوە و بسپێرێت.

### ٣- قۆناغی پەروەردە و فێرکردنی ڕەسمی:

کەوا بوو، دوو جۆرە پەروەردە و فێرکردن هەن: یەکێکیان ئەوەیە کە هەر کەس لە نێو ڕەوتی ژیاندا کەڵکی لێ وەردەگرێ، ئەویتریان زانستانە ڕاست و ڕەوان فێر دەبێت و بە نەوەی نوێش دەگەیەنێت. پەروەردەو فێرکردن کە لە نێو ڕێڕەوی ژیاندا دروست دەبێت، وێڕای ئەوەی خۆڕسک و ناڕێکە، بەڵام گرنگی زۆریشی هەیە. ئەگەرچی مرۆڤ لە سەرەتاوە ئاگای لە پەروەردە و ڕەفتاری خۆی نەبووە، شێوە سەرەتاییەکی سرووشتی و خۆڕسکی پەروەردە و فێرکردنی بە دەست هێناوە، بەڵام ناتوانین منداڵ بدەینە دەستی ئەو شێوە پەروەردەییەو گرنگی و هۆکاری پەروەردەی گەورەکان لەودا نەخەینە بەر سەرنج و



هەڵسەنگاندن و ڕەخنە لێگرتن. بێ ئاگا بوون لەمە، گەرچی لەسەرەتاکانی دروست بوونی کۆمەڵگا ئەوەندە گرنگ نەبووە، بەڵام بۆ منداڵی ئێستا زۆر ناڕەوایە. چونکە ئەمڕۆ لە پێگەیاندنیاندا یارمەتی نەپچڕاویان دەوێ و ئاڵوگۆڕ لە نێو ئارەزوو و خولیاکانیان ئەوەندە پێویستە کە ناتوانرێ بە حاڵی خۆیانەوە بەرەڵا بکرێن، تابە پێی رابردوو ڕەوتی ڕووداوەکان و ڕەفتاری داڵدە دەرانیان ڕانێن.

ئەرکی سەرەکی ئێمە سەبارەت بە منداڵان ئەوەیە کە بیانکەین بە شەریکو هاو بەشی ئەندامانی کۆمەڵ، ناچارین و ناتوانین سەبارەت بە ڕاهێنانی ئەو وزانەی، کە کەرەسەی دەسکەوتی ئەم ئامانجەن، بێ لایەن و بێ مەیل بین! لەم ڕووەوە ئەکرێ بووترێ کە پەروەردە و فێرکردن دیاردەیەکە، کە ئەنجام و گرنگییان هەر لە دێر زەمانەوە سەرنجی مرۆڤی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە.

لە جەرگەی پەروەردە و فێر کردنێکی بەربڵاو کە تا ئێستا تیشکمان خستووەتە سەری، جۆرێکی ڕەسمی و چوارچمکییە، کە دەبێتە ڕاهێنانێکی ڕاستەوخۆ یان فێرگەیی. پێگەیاندنی ڕەسمی لەکۆمەڵگا تازە پیگەیشتووەکاندا چەمکێکی نەگەشاوە و زۆر تەنگ و بچووکی هەیە.

لە کۆمەڵگاکانی کۆندا و تەنانەت ئێستاشی لەگەڵ بێت، ژیانی کۆمەڵایەتی، تاکی لاو (باڵغ) دەخەنە نێو قاڵبی پەیمانی خۆیانەوە، واتە ژێر ڕکێفی خۆیان، منداڵەکانیشیان کردووەتە لایەنگری مەیل و داواکانی ئەو کۆمەڵگایە. لەم چەشنە کۆمەڵگایەدا چاوپۆشی لە هەندێک کار و تێکۆشان کە بۆ ناساندن و پێناسینی لاوانە کە ئەویش بە ئەرکی کۆمەڵایەتی دەژمێردرێت؛ نیشانەیەک لە ڕێکخراو و ئامرازی فێربوون بوونی نییە. منداڵانی ئەو کۆمەڵە ناشارستانی و "کێوییە" بەگشتی لەڕێگای بەشداربوون لە کارو کردەوەی بنەماڵەکانیان، شێوە و ڕێ و ڕەسمی و خۆشەویستی و بیروبۆچوونی کۆمەڵایەتی خۆیان فێر ئەبن.

بەشێک لەم فێربوونە راستەوخۆیە، واتە منداڵان بۆ کارێکی دیاریکراو و تایبەت لە لای گەورەکانیان بەردەستی و شاگردی دەکەن. بەڵام بەشەکەی تریان ناڕاستەوخۆ هەوێن دەگرێت، بەو واتایە، کە منداڵان لە ماوەی ئەنجامدانی وێنە و شانۆگەرییەکان، دەکەونە لاسایی کردنەوەی گەورەکان و بەم شێوەیە فێری دەبن. کەوابوو ئەو کۆمەڵە نامەدەنییە، ناتوانن لە واتای فێرگە بگەن، واتە شوێنێک کە بێجگە لە فێرکردن شتێتری تیا نەکرێت.

بەڵام، بە پێی گەشە کردنی شارستانییەت، جیاوازی نێوان منداڵی بچووک و گەورە پوخت و ئاشکرایە، مەودایەکی زۆرتر دێتەبوون لەوێدا منداڵان ناتوانن تەنیا بەشداری لە کاری گەورەکان بکەن، دروست ڕێوڕەسمی کۆمەڵگا فێر بن، چونکە زۆر لە کاری گەورەکان لەو شوێنانەی منداڵانی لێیە جێبەجێ دەبێ، زۆر لەو کارانە لە توانا و فامی منداڵاندا نین. لەم رووەوە لاسایی نەوەیان کەم کەم گرنگی ئەو پێگەیاندنە سەرەتاییەی خۆی لە دەس دەدات. پێویستە کۆمەڵ لە پێشدا تاکەکانی خۆی بۆ تێکۆشانی ژیان ئامادە بکات و رایان بهێنێت، پاشان کاریان پێبسپێرێت. بەم شێوەیە دامەزراوەیەک بە ناوی فێرگە دێتەبوون کە بە شێوەیەکی زانستی و گشتی، داخوازییەکی لە قاڵب دراو کە (وانە)ی پێدەووترێت، فێری نەوەی نوێ دەکەن.

لە کۆمەڵگای پێشکەوتوودا گوێزانەوەی ئەو هەموو میرات و پاشماوە کۆمەڵایەتییانە، بە بێ پەروەردە و فێرکردنی ڕەسمی جێبەجێ نابێت. لەوەش گەڕێین، منداڵانی پێشکەوتوو لەگەڵ کتێب و خوێندنەوە، کە کەرەستەیەکن بۆ برەو پێدانی زانیارییەکان، خوو دەگرن. بەڵام پەروەردە و فێربوونی رەسمی و راستەوخۆ لە بەرامبەر ناڕاستەوخۆ، دەبێتە هۆی گرفت، و بەربەستی زۆر دروست دەکات. پەروەردە و فێرکردنی ناڕاستەوخۆ واتە لاسایی کردنەوەی گەورەتران و هاوکارییان



پێکەوە، خۆی لە خۆیدا هەست بزوێن و خۆشە، بەڵام پەروەردەکردنی ڕەسمی و ڕاستەوخۆ بەگشتی وشک و سارد و سڕە و شتێکی کتێبی و (نەکردەنییە). لە کۆمەڵگای سەرەتایی و نوێدا فێرکردنی ناڕاستەوخۆ کارێکی بە تەواوی (کردارییە)، ئەو ئەزموونە کەمەی کە منداڵ لەو بوارەدا بە دەستی دێنێت، بە کردەوە دەبیاتە کار و کەڵکی لێوەردگرێت. ئەو جۆرە زانیارییانە کە بەشێکن لە پێداویستییە گرنگەکانی رۆژانەیان، واتای قووڵی هەیە و ئاوێتەی کەسایەتییان دەبێت. لە کۆمەڵگای پێشکەوتوودا زۆربەی ئەو زانیارییانەی کە فێری منداڵان ئەکرێن، زانیاری کتێبییە و ناتوانرێ بە ئاسانی جێگای لاسایی و کردەوە خۆڕسکییەکانی رۆژانەیان بگرێتەوە.

زۆربەی ئەم زانیارییە ڕەواڵەتی و سادە و دەستکردانە، لەگەڵ ڕەوتی ئەو ژیانە بە (واقیع) و کردەوە، ناگونجێت. وانە دەرسییەکانی فێرگەکان لەگەڵ ئەزموونەکانی ژیانی مرۆڤ نزیک نین و بریتی نابێت لەو شتانەی کەجێگای داخوازی کۆمەڵ بێت. بەشی سەرەکی ئەم وانەیە بە ژیانی (واقیعی)یەوە نابەستریتەوە و لەڕاستیدا لایەنی رواڵەتی و هونەری هەیە. بێگومان کاتێک پەروەردە و فێرکردن بەم شیوەیە بڕوات، لە گەیاندنی پەیامی ئەسڵی خۆیەوە دوا دەکەوێت و بە جێ دەمێنێت. پەروەردە و فێرکردن بەم واتایە، هەوڵێکە بە دوور لە پێویستییەکانی کۆمەڵگا و ئەو پەیوەندییە مرۆییانەن کە دونیای زەین بەهێز دەکەن.

کاری گرنگی پەروەردە و فێرکردن ئەوەیە کە بە هۆی کتێبەوە زانیاری دوور لە (واقیعی) ژیان بە نەوەی نوێ بدات. لێرەدایە کە یەکێک لە مەترسیدارترین گرفتە بنەماییەکانی پەروەردە و فێرکردن، دانانی رەوشێکە بۆ پێکهێنانی هاوسەنگی گرتنی نێوان لایەنە رەسمی و ناڕەسمییەکان، یان دەستکردی و سروشتییەکان. کاتێک کە زانیاری و توانای فیکری و هونەری لە بوون و کەسایەتییەکدا ڕەنگ ئەداتەوە، ئەو

تاکە یان ئەو کەسە ناتوانێت بە تەواوی لە واتا و ئەزموونەکان خۆی و دەوروبەری تێبگات، و ئامانجەکەی شتێکی بێجگە لە پیلانی شارەزایانی خۆ ویست و دوور لە ژیانی واقیعی نابێت و نییە، دەبێ کارێک بکرێت کە لە نێوان فێرکردنی رەسمی و ژیانی واقیعی پەیوەندییەک دروستبێت. مرۆڤ بەشێکی زۆری زانیاری خۆی لەڕێگای خوێندنگا رەسمی و گرنگەکانەوە فێردەبێت و لەم رووەوە سەبارەت بەم جۆرە زانستەی خۆیان سەرنجێکی پێداگرانەیان هەیە. بەڵام بەشێکی دیکەی خەڵک زانیاری خۆیان لە کاتی ژیانی رۆژانەدا و بە هۆی تێکەڵاوی و پەیوەندی لەگەڵ دەوروبەردا بە دەست دێنن، هەر بۆیە لە چۆنیەتی ئەو بەشەیان ئاگادار نین. هەرچی بواری پەروەردە و فێرکردنی رەسمی پان و فراوان بێت، دژایەتی ئەم دوو جۆرە زانیارییانە واتە هۆشیاری و ناهۆشیاری، زیاتر دەبێت، چارەسەری ئەم دژایەتییە گرنگیی زۆرتری پێدەدرێت.



## پوختەیەک

بوون و بنەمای ژیان، بەردەوامی ژیان دەسەلمێنێت. لە بەر ئەوەی بەردەوام بوونی ژیان مانەوەی تەنیا بە هۆی نۆژەن و دووبارە بوونەوە بەردەوامە و دەچێتە پێش. دەبێ ژیان بە رەوتێک بزانرێ کە هەر کاری نوێ بوونەوە و نوێسازییە.

نوێ بونەوە و نوێسازی ژیانی جەستەیی بە خواردن و خواردنەوە و خۆ دروست کردنو زاو و زێ ڕەنگ ئەگرێت، نوێ کردنەوە و دووبارە کردنەوەی ژیانی کۆمەڵایەتیش، بە پەروەردە و فێرکردن. کاری سەرەکی پەروەردە و فێرکردن ئەوەیە کە لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵدا پەیوەندی دروست بکات و لەم ڕێگوزەرو تێپەڕبوونەدا میراتە کۆمەڵایەتییەکان لە نەسڵی کۆن بۆ نوێ بگوازێتەوە. پەیوەندی دەبێتە هۆی گەیشتنی ئەزموونەکان بە یەکتر بەم هۆیەوە دەبنە هاوبەش. ئەم پەیوەندییە هەر دوو لای پەیوەندییەکە ئەگۆڕێت. هەموو بۆنە کۆمەڵایەتییەکان لە ئەنجامی کاردا دەبێتە هۆی گۆڕان و گەشە کردنی ئەزموونەکانی مرۆڤ. بەڵام ئەم پێکهاتەیە لەنەوەی نوێدا زیاتر خۆ دەنوێنێت.

پەیوەندی مرۆڤە باڵغەکان لەگەڵ لاوان، لە گرنگی باڵغەکان لەگەڵ یەکتری، کاریگەری زۆری لەڕووی پەروەردەییەوە هەیە. هەرچی زانیاری و کرداریان زۆرتر و گرنگتر بێت، پەروەردەی نەوەی نوێ بەربڵاوتر، فێرکردن و بەخێوکردن گرنگتر دەبێت. هەرچی زانستی فێربوون و فێرکردن پێش بکەوێت، نێوانی ئەزموونەکانی ڕاستەوخۆیی مرۆڤ و زانیاری کتێبی مەودایەکی زۆرتر بەخۆوە دەبینێت، و بەرفراوانی و ترسی ئەم نێوانە بەردەوام زیاتر دەبێت. بە هۆی پێشرەوی و بەرز بوونەوەی ئاستی زانست و فێربوونی کارە هونەرەییەکان لەم چەند سەدەی دواییەدا، خولی ئێستا لە خولەکانی پێشوو زیاتر تووشی ناسازگاری و ئەزموونی تاکەکەسی و زانستە دەرسییەکان، بەرەوڕوو بووە.

## بەشی دووەم:

## پەروەردە و فێرکردن دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە

### ١- مانا و نێوەڕۆکی ژینگە:

ئەوەمان زانی کە کۆمەڵگا، یان لایەنی کۆمەڵایەتی بە هۆی نوێ کردنەوەوە بەردەوامە، ئەم رەوتە لە ڕێگا و بە یاریدەی فێرکردن و راهێنانی ئەندامانی لاوی تازە پێگەیشتوو ڕەنگ دەگرێت و دەچێتە پێش. کۆمەڵ لەم روانگەیەوە بە شێوەیەکی تر دەگۆڕێ، و شارەزایانی جێی باوەڕ دەخولقێنێت و پاشماوە و ئامانجەکانی خۆی بەوان دەسپێرێت. بۆیە پەروەردە و فێرکردن رەوتێکە بۆ پێگەیاندن و لە ئاو دەرهێنانی ئەندامانی کۆمەڵ. لەم وشانە بە چاکی دردەکەوێت کە پەروەردەو فێرکردن دەستخۆشی سەرنجێکی تایبەت بە هەلومەرجی ڕەخساو و گەشە کردنە. بۆ شیکردنەوەی قۆناغە جۆراو جۆرەکانی گەشەی پەروەردەکردنی، دەکرێ دەستەواژەی وەک "پێگەیاندن "گەورەکردن"، بەکاربهێنرێ. ئەگەر ناوەڕۆکی کاردانەوەی رەوتی پەروەردە و فێرکردن لە بەرچاو بگرین، ئەتوانین بڵێین کە ئەم رەوتە، تێکۆشانێکە کە بە فیکر و زەینی مرۆڤ شێوە و قەوارە و یاسا دەبەخشێت و دەیکاتە پاڵپشتێکی پاراستنی رەوتی کۆمەڵ.

ئێستا دەبێ بزانین بە شێوەیەکی گشتی گرووپێک لە کۆمەڵدا چۆن ئەندامانی نوێی خۆیان لەگەڵ ڕەوتی ئامانجیان هەماهەنگ ئەکەن؟ مەبەستەکەمان لەم بەشەداو مەبەستی ئاڵوگۆڕ پێکهێنانە لە منداڵدا. ئەم گۆڕانە گۆڕانێکی جەستەیی نییە، بەڵکو بە جۆرێکیتر سازکردنی ئەزموونەکانی منداڵ و راهێنانی بۆ هاودەنگی و هاوکاری لەگەڵ ویست



و ئامانج و ئەفکاری کۆمەڵگایە. ئەم گۆڕانکارییانە لایەنی ئارەزوویی هەیە و دووره لەوەی کە رەوتی پێخۆشبوون و بیروباوەڕ لەم بابەتانە، بتوانرێ وەک شتومەکی بەرچاو لە شوێنێک بۆ شوێنێک و لە کەسێک بۆ کەسێکیتر بگوێزرێتەوە. کە وایە ئەم پرسیارە دێتەگۆڕێ: چۆن دەبێ هۆکاری ئەو ویستە بگوێزرێتەوە؟ ئێستا ناتوانین ئەم ویستە راستەوخۆ بڵێین و بڵاو بکەینەوە، دەبێ بزانین کە بە کردەوە لاوان چۆن بیروڕای "پیرەکان" واتە بە ساڵاچوان وەردەگرن؟ بەساڵاچوان چۆن نەوەی نوێ وەک خۆیان فێردەکەن؟ بە شێوەیەکی گشتی دەبێ بڵێین کە ئەم جۆرە گۆڕانکارییانە ماکی زادەی کاردانەوەیەکن کە ژینگە بە مەیل و ئارەزووی خۆی لە ناخی مرۆڤدا چاندوویەتی.

ئێمە ناتوانین بیروباوەڕ بە چەکوشکاری و بە شێوەی بەرچاو و دروست دەربهێنین، یان حاڵەت و بیروباوەڕی مرۆڤ وەک گەچ قاڵبگیری بکەین. هەر کەسێک بە پێی پێویستی ژینگە و دەوروبەری تایبەت بەخۆی هەندێک کار و کردەوە و شت ئەنجام دەدات و پابەند دەبێت، بە گوێرەی ئەوانەش پێزانین و فامی تایبەت دروست دەبێت. ژینگە مرۆڤ ناچار ئەکات کە بۆ پاراستنی سەرکەوتنی خۆی لە بەرامبەر کەسانیتردا چەند پلانێکی دیاریکراو بکێشێت. ژینگە مرۆڤ هان ئەدات کە بۆ بەدەسهێنانی هاودەنگی کەسانێک، لە هەندێک، بیر و باوەڕ وەربگرێت و لە هەندێک دووری بگرێت و وەرچەرخێت. لەم رووەوە ژینگە هێدی هێدی یاسایەکی دیاری کراو بە سەر رەفتار و کرداری مرۆڤدا دەسەپێنێ. وشەی (ژینگە) یان (مەڵبەند) تەنیا بە واتای شت و مەک و کەرەسەگەلی دەوروبەری مرۆڤ نییە، بەڵکو واتایەکی بەرفراوانتری هەیە. ئەم وشانە باس لە نوێ بوونەوەی تایبەت ئەکەن کە مرۆڤ دەخاتە قاڵبی خۆیەوە و دەیبەسێتەوە بە شتەکانی دەوروپشتیەوە.

هەڵبەت نێوانی بوونەوەرێکی بێ گیان و دەوروبەری و ئەو مەڵبەندەی تێدایە، جۆرێک پەیوەندی هەیە، بەڵام ئەم پەیوەندییە بە ئێمە ڕێگا نادات کە وشەی" ژینگە" بەکار بهێنین، مەگەر بەمانای (مەجازی) بە کاری بهێنین، چونکە گەرچی شت و مەکە بەرچاوەکانی دەوروبەری بوونەوەری بێ گیان لەم ڕووەوە کاریگەریشیان هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خاڵی گرنگ ئەمەیە کە بوونەوەرێکی بێ گیان بێ سەرنج و ڕا، ناکەوێتە بەر کاریگەرییەوە، کە چی بوونەوەری گیاندار بە تایبەت مرۆڤ، لەوانەیە لەگەڵ شتێکدا لەرووی کات و شوێنەوە دوور بێت، بەڵام گرنگی و کاریگەری خۆی هەیە. لەم ڕووەوە کاریگەری ژینگەی مرۆڤ لە کاریگەر بوونی شتەکانی نزیکی جیاوازییان هەیە.

سوننەتی ژینگەی هەر کەسێک ئەو میکانیزم و ئامێرانەن کە گۆڕانی تیا دروست ئەکەن. بەم شێوەیە دبێ بڵێین کە دووربینی ئەستێرەناسێک یەکێک لە هۆکارەکانی ژینگەی بێ ئەم لاو لای ئەوە، ئەو ئەستێرانەی کە لەو تێکۆشانە زانستییەدا هانی دەدەن بە بەشێک لە ژینگەی ئەو دەژمێردرێن. ژینگەی کۆنەوار ناسێکیش بریتییە لەو کۆنانەی کە لە پێش دیدو ڕوانینیدان. شوێنەوارو نووسراوە و پاشماوەکان و باقی هۆکارەکانیتر کە ئەوانە دەبەستێتەوە بە رابردووەوە بەشێکن لە ژینگەی ئەوان. بە کورتی، ژینگە بریتییە لەو پێشهات و ڕووداوانەی کە ڕەوتی تێکۆشان و هەوڵ و تەقەلا تایبەتییەکانی بوونەوەری زیندوو خێرا دەکات، یان پاشی ئەخات، یان ڕایدەگرێت و دەیوەستێنێت.

ئاو ژینگەی ماسییەکانە، چونکە بێ ئاو مانەوە و تێکۆشانیان مسۆگەر نابێت و دەمرن. ژیان دەستخۆشی هەوڵ و تەقەلایە و بە دژکردەوە ناگونجێت، هەروەها ژینگە بۆ خۆی هۆکارە کە ئەم هەوڵ و تێکۆشانە بپارێزێ یان بوەستێنێت.



### ٢- ژینگەی کۆمەڵایەتی:

هەوڵ و تەقەلای گیانلەبەرێک هاوبەشە لەگەڵ تێکۆشانی بوونەوەرانی دەوروبەرییەوە و ئەوەی دەیکات و دەتوانێت جێبەجێی بکات بەستراوە بە ویست و داخوازی و کەموکوڕی ئەوانیترەوە. چونکە هەوڵ و تەقەلای ئەوانەی دەوروبەری بەشێکن لە فەرمان و ڕەوش و دەستووری کاری ئەو، تێکۆشانی ئەو لەسەر کەسانیتردا کاریگەری هەیە. گەر بمانەوێ هەوڵی کەسێک بە بێ لە بەرچاوگرتنی کەسانیتر دەسنیشان بکەین و تیشک بخەینە سەری، خەیاڵێکی خاوە. هەر وەک مامەڵەچییەک ناتوانێت لەگەڵ خۆیدا مامەڵە بکات، هیچ کەسێک بە تەواوی ناتوانێت بە تەنیا لە سەر پێی خۆی راوەستێت.

سەوداگەر نەک تەنیا لە کاری کڕین و فرۆشتنی کاڵا و جنسەکاندا، بەڵکو تەنانەت کاتێک لە خەڵوە و پەناشدا پلان و نەخشە دەکێشێت و کاری کۆمەڵی دەکات، فیکر و هەستی کەسێک کە بە کردەوە لەگەڵ کەسانیتر پەیوەندی عەمەلی هەیە، وەک کردەوەی دۆستانە، یان نادۆستانەی ئاشکرای ئەو لە ژیانی کۆمەڵایەتییەوە سەرهەڵدەدەن. خاڵێک کە دەبێ بەجوانی ڕوون بکرێتەوە ئەوەیە کە، ژینگەی کۆمەڵایەتی چۆن چۆنی ئەندامانی لاوی خۆی پەروەردە دەکات؟

هەموو ئێمە بە ئاسانی دەتوانین ڕەوتی کۆمەڵگە لە پێکهاتەی ڕەوشت و کردەوە دەرەکییەکانی تاک بناسین. نە تەنیا تاکی مرۆیی، بەڵکو سەگەکان و ئەسپەکانیش، بەهۆی ژیانیان لەگەڵ مرۆڤ، گۆڕان بە سەر ژیانیاندا دێت و دەگۆڕدرێن. مرۆڤ چۆن هەر لە دێرزەمانەوە بە سەگ و ئەسپ پەیوەندی هەبووە، ئێستاش ئەو پەیوەندییە هەر هەیە و دەیپارێزێ، دەست لە (غەریزە) سرووشتییەکانیان (وەرئەدەن) و بەم دەستتێوەردانە ژینگەیەکی دەسکرد بۆ ئەوان پێک دێنن.

بۆ نموونە:  بۆ گەشە پێدان و گۆڕینی دژکردەوە سروشتییەکان یان ((غەریزە))ی ئەسپەکان، لەمەودای خۆراکی و هەوسار((رەشۆ)) و لەغاو و شەلاق و هاوار کردن کەڵک وەردەگرنو بە یاریدەی ئەو کەرەسانەو دووپات کردنەوەی ئەو دەنگ و هەرایانەی ئاژەڵەکان پێی گوێڕایەڵ دەبن، رەوشتگەلێک کە وەک کردەوە بەیەک جۆرو نەگۆڕ، یەکجۆر و سابت لەواندا دێنێتەبوون.

با روونتر بڵێم: رەوشت و خوڵقی ئاژەڵەکانی نزیک و دەستەمۆ و بومیی هەر کۆمەڵ و دەستە و تاقمێک، کاریگەری رەوشت و خولقی دانیشتوانی ئەو کۆمەڵ و دەستەیە، کە لە ناخی ئەو ئاژەڵانەشدا رەنگ ئەداتەوە و تێکەڵ ئەبێت. ئەوانەی کە کوردەواری خۆمانیان لە بیر بێت و سەردانیشوێنگەلیتر و بە تایبەت ئەوروپایان کردبێت و  ئاژەڵی هەردوو لایان دیبێت دەزانن کە ئاژەڵەکانیش لەڕووی سایکۆلۆژییەوە چەندە جیاوازن. من بۆ خۆم ئەو ئەزموونانەم زۆر تاقی کردووەتەوە.

ئەگەر مشکێک بکەینە قەفەسەیەکی خوار و خێچ و ناچاری کەین بۆ دەست پێڕاگەیشتنی خۆراکی لە چەند پێچ و لاری بە دوای یەکدا بڕوات، زوو یان درەنگ بەم کارە رادێت و لەمەودوا خۆ بە خۆ و بە هاسانی دەستی بە خۆراکی خۆی رادەگات. کردەوە مرۆییەکانیش هەر بەم شێوە دەگۆڕدرێن. باقی شێوە پەروەردەییەکانی مرۆڤ لە فێرکاریدا چەندان جیاوازییان نییە و بە نۆبەی خۆی کردەوە دەرەکی و ئەفکار و هەست و سۆزەکان مرۆڤیش دەگۆڕێت. لە هەندێک بواردا ئەتوانرێ بە گۆڕینی ژینگە و گواستنەوەی منداڵ، هەر دوو کرداری دەرەکی و ناوەکی بگۆڕین، بەڵام ئەم دوانە هەردەم پێکەوە ناگونجێن و یەک ناگرنەوە، وەک ئەوەی کە کەسێک بۆ کارێکی تۆقێنەر پەروەردە کرابێت، ئەتوانێ بە بێ هیچ هەست و سۆزێک ئەو کارەساتە بخوڵقێنێ و ئەنجامی بدات. ئێستا با بزانین جیاوازی فێرکاری و پەروەردە و فێرکردن چییە و چین.



ئەتوانین بڵێین کە، چونکە بە راهێنانی ئەسپێک واتە گرنگی بە گۆڕانی عادەتەکانی ئەدەین، ئەسپ لەو کردەوانەی کە بەو ئەنجامی ئەدەین بە هیچ شێوەیەک بەشدار نییە، ئێمەین لە بەرژەوەندی خۆمان، ئەو فێری ئەو کارانە ئەکەین. ئەسپ سەبارەت بە ئامانجی ئێمە و کارێک کە بۆمانی ئەنجام ئەدات ئاگەدار نییە و پێی نازانێت، تەنیا بەو خواردنە ئەزانێت و مەیلی هەیە کە ئیمە پێی ئەدەین.

ئاژەڵەکان هاوبەشی کار و کردەوە و ئامانجەکانی ئێمە نین، ئەگەر هاوبەش بوونایە هەرگیز ئامادە نەبوون ملکەچی بۆ فیکر و هەستەکانمان بکەن. کە چی ئێمە لە زۆر بواری فراوانەوە دەست لە تێکۆشانی تاکی پێگەیشتووی کۆمەڵ وەرئەدەین و بڕیار ئەدەین کە گوایا رەوشتی بە کەڵک لەودا بە بوون بێنین. لەم رووەوە رەفتاری ئێمە لەگەڵ  ئەودا رەفتارێکە لەگەڵ ئاژەڵەکان دەیکەین.!

کارەکانمان لێرەدا، راهێنانە نەک فێرکردن. لەم ڕووەوە غەریزەکانی ئەو لە هەموو ویستە خۆش و ناخۆشەکانی بنەڕەتی خۆی جیا نابێتەوە. بەڵام ئەو کەسە بۆ ئەوەی بەختەوەر بێت یان لە رەنجی شکاو و دۆڕاو پارێزراو بێت، دەبێ هەرچۆنیک بێت وا بکات کە بتوانێت پێخۆشبوونی خەڵک وەربگرێت و لە تێکۆشانی هاوبەشی ئەواندا بەشدار بێت. لە وەها کردارێکدا پاڵپێوەنەرانی دەروونی ئەو سەرنجی مەیل و خواستی نوێ ئەدەن. بەو واتایەی کە نەک کرداری ئەو لەگەڵ کردەوەی کەسانیتردا یەک دەنگ دەبن، بەڵکو لەڕاستیدا ئەو هاودەنگییەی لە  دەروونیدا دروست دەبێ هەمان فیکر و هەستێکن کە بە سەر ئەودا زاڵن.

لە نێو قەومێکی شەڕانیدا کە سەرکەوتن و پیرۆزی کۆمەڵەکەیان، لەڕێگای شەڕەوە بە دەست دێنن، منداڵەکانیشیان دەبێ بەویستی ئەوان و ئەو ژینگە شەڕاوییە فێرکەن کە دەبێ لە کار و یاریدا، لە خۆ نماییەکی روو دژانە و کێشمەکێشمدا خۆ بنوێنێ. کاتێک ئامادەی شەڕ دەبێت

دەکەوێتە بەر ستایشی دانیشتوانی دەوروبەر و نرخ و گرنگی پەیا ئەکات، بە پێچەوانەکەشی کە لەو بوارەدا خۆ بدزێتەوە، ئەکەوێتە بەر تانە و تەشەر و توانج و رووبەڕووی بێ رێزی ئەبێتەوە.

روون و ئاشکرایە کە ئەم جۆرە ژینگە بوار بە ویست و خواستە شەڕاوی و سەرکێشییەکەی ئەو دەدات، بۆ خۆ نوێنی لەو گۆڕەپانەدا سەرنجی چوار دەوری رادەکێشێت. لە ئەنجامدا بیر و هەستی ئەو دەچێتە ریزی کاروباری جەنگەوە و بەم شێوەیە دەبێتە ئەندامی رەسمی و رۆڵەی بە باوەڕی ئەو کۆمەڵە، رووداوە دەروونییەکانی کەم کەم لە رەنگ و شێوەی رەوتە گشتییەکانی دەروون دێتە دەرەوە. ئەم نموونە بە باشی پیشانی ئەدات کە ژینگەی کۆمەڵایەتی، ویست و ئەفکاری ڕوون و دەستنیشانکراو، راستەوخۆ ناخاتە بوونی تاکەوە، ڕەوشت و کاری دیاری کراوی بەسەردا ناسەپێنێت. ژینگە لە سەرەتاوە بوارێک ئەڕەخسێنێت و بەو هۆیانەوە تاک رائەکێشێت بەرەو رەوشە کردارییە دیاریکراوەکان و پاشان بەشداری ئەکات لە هەموو تێکۆشانە گشتییە هاوبەشەکان، بەجۆرێک کە تاک لەوەو پاش سەرکەوتنی گشتی و پاشکەوتن و براوە و دۆڕاو بە هی خۆی دەزانێت. هەر کات تاک لە ویستەکانی کۆمەڵ بەشدار بوو، دەتوانیت ئەو میکانیزمانە بەدەست بێنێ کە پەیوەستە بە بەدیهێنانی ئامانجەکانی کۆمەڵ. بەجۆریکیتر، بیروباوەڕی ئەو لەگەڵ بیروباوەڕی ئەندامانی کۆمەڵ یەک دەگرن و دەبنە یەک و دەستی دەگات بەو گەنجینە زانستییە هاوبەشانەی ئەو کۆمەڵگا، کە بەشێکن لە تەقالاکانی ئەو.

**٣- گرنگی فێرگە:**

لە باسەکانی پێشوودا دەردەکەوێ کە تاکە پێگەیشتووەکانی کۆمەڵگا بۆ ئەوەی بە تەواوی رەوتی پەروەردە و فێرکردنی نەوەی نوێ بگرنە

ئەستۆ، دەبێ بچنە بنج و بناوانی کردار و فام و ویستەکانیان. پەروەردە و فێرکردن هیچ کاتێک لە کاریگەری ژینگە بە دوور و بێ لایەن نییە، بەڵکو و پێکەوە تەواوکەری یەکترن. بەڵام ئەو فێرکاری و راهێنانەی لە ژینگەیەکی نالەبار و شێواودا دەچێتە ڕێوە لەگەڵ پەروەردە و فێرکردنێک کە لە ژینگەیەکی خاوێن و ڕێکوپێکدایە، جیاوازی زۆری هەیە. هەر ژینگەیەک کە بۆ ئەم بوارە گونجاو نەبێت دەبێ ناوی ژینگەی نەپۆری لێ بنرێت. هەردوو رووی باش و خراپی ژینگە کاریگەری لە سەر باری دەروونی و هۆشی منداڵ هەیە.

دەبێ جێگایەک هەڵبژێرین کە یاریدەدەری رووە دەروونییەکانی منداڵ بێت، ئەو کەرەسانەی کە بۆ هێور کردنەوە و ئارام کردنەوەی دەروونی و جەستەیی منداڵ پێویستن ڕێک بخرێن. لە سەر یەک فێرگە کاتێک پێک دێت کە رەوش و رەفتاری کۆمەڵایەتی گەشە بکات و بەرفراوان بێت، بۆ گواستنەوەی بەشە گرنگەکان، پێویستی بە کتێب و نووسراوەو بەڵگە هەیە. بێگومان نووسراوە و کتێب لە باسی ژیانی رۆژانە و راستی دوورترە و ئەو داواکاری و شتانەی لەوێدا دێن، نووسراون و جێگیر ئەکرێن، بەڕادەی پێویست لە سەر رووداوەکانی رۆژانە ڕێک دەرناچن. بە واتایەکیتر، بەشێکی گرنگ لە پاشماوەی ((میراتەکانی)) کۆمەڵگا کە لە کتێبدا هاتوون بۆ پێداویستییەکانی ژیانی حاڵ بە کەڵک نین. بەم لێکدانەوەیە هەر کۆمەڵگەیەک کە پاشماوەکانی فەرهەنگی ئەوەندە بەرفراوان بێتەوە کە نەتوانن لە رەوتی ژیانی مەیدانیدا فریای کەون، بێگومان ئەوە لە فێرگە و کتێبەوە هاتووەتە درێ.

هەر وەک دەزانین کۆمەڵگای هاوچەرخی رۆژئاوا لە ژێر کاریگەرییەکی توندی فەرهەنگی ((یونان)) و ((ڕۆم)) ی کۆن بوون و دەبوایە فێری بن و پێی ئاشنا بن. بەڵام چونکە میکانیزمی ژیانی یۆنانی و رۆمییە کۆنەکان راستەوخۆ لە ئەزموونی رۆژانەی رۆژئاواییەکاندا



ڕێگایان نەبوو، دەبوایە فەرهەنگی ئەوان لە نووسراوەکانی خۆیان بگونجێنن و لە قوتابخانەکاندا بیڵێنەوە. لە سەر ئەم شێوەیە هەندێک لە گەلانی هاوچەرخی ئێمەش، بەداخەوە کاریگەری فەرهەنگییان لە سەر ئێمەی کورد هەبووە و لە دوور و نزیکەوە خاڵی نێگەتیڤی داناوە، کۆمەڵی ئێمەش کە لەو بوارانەدا هەژار و دواکەوتوو بووە بە تەواوی چووەتە ژێر ئەو بارە قورس و گرانانەی کە نەک هەر شتی چاکی لێ فێر نەبووین و نەمان توانیبوو بە قازانجی خۆمان کەڵکی لێوەرگرین، بە پێچەوانەوە خۆشمانمان پێ ونکردبوو؛ وا تازە خەریکین پەی بەو میکانیزمە خراپانە دەبەین.

بیرۆکەی رۆژئاوایی لەو سەردەمەدا بیرۆکەیەکی فەرهەنگی شارستانی و پێشکەوتنخوازی بووە، بەڵام بیرۆکەی گەلانی ناوەڕاست بە داخەوە پێچەوانە بوو، هەر بۆیە ئەو جیاوازییە گەورەیەش کە ئێستا بە چاوی خۆمان دەیبینین دەزانین کە چەندە ئێمە بە پاش کەوتووین. بە هەرحاڵ با بچینەوە سەر داواکاری سەرەکی، لە هەر کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوودا بۆ گواستنەوەی هەر جۆرە زانستێک جۆرێک ئامێر و میکانیزم کە پێی دەڵێن فێرگە پێویستی هەیە. فێرگە لە بەرامبەر ئامرازی بە مەیدانی کردنی گواستنەوەی پاشماوەکان، سێ لایەنی تایبەتی هەیە.

أ- فێرگە شوێنێکی دەستکردە کە هۆکارە بنەڕەتییەکانی ژینگەی کۆمەڵایەتی ئەخاتە ژێر باڵی خۆی. بۆیە ئەم پێشکەوتنە پێچ و پڵۆچانە، ئەمرۆ ناتوانین هەمووی بە یەک جار فێر بین، دەبێ هەر کامەیان دابەش بکەینە سەر چەند بەش و پاشان کەم کەم یەک بە دوای یەکدا وەریبگێڕین و فێری بین. (بۆنەکان) ژیانی کۆمەڵایەتی ئەوەندە زۆر و خوار و خێچن، کە منداڵ، تەنانەت ئەگەر لە رەوشێکی باشیشدا بێت، دیسان ناتوانێت بە ئاسانی لە زۆر بۆنەی گرنگدا خۆ هەڵقورتێنێت و بەشدار بێت لە واتایان تێ بگات، هەرچەندە ئەمرۆ دونیا دونیایەکی

زۆر پێشکەوتوو و خاوەن کەرەسە و میکانیزمی زۆر خێرا و فێرکردنە و بواری زۆری رەخساندووە و کارئاسانی زۆری کردووە بۆ فێربوون و فێر کردن و گەشە پێدان، بەڵام دیسان کەمی ئەهێنین. هەروەها منداڵ ناتوانێت کارگەلێک وەک کڕین و فرۆشتن، رامیاری و هونەر، زانست و دین بە جارێک فێر بێت و بزانێت. واتە یەکەمین ئەرکی پەروەردە و فێرکردن رێکخستنی ژینگەیەکی تاڕادەیەک سادەیە. فێرگە، بەشێک لەو میکانیزمەی کۆمەڵگا، کە گرنگن بۆ ژیان و لە چوارچێوەی تێگەیشتنی منداڵ ئەگونجێن، دەخاتە پێش و دابەشیان دەکات و بەش بەش دەست دەکات بە وتنەوە و فێرکردنیان.

ب- فێرگە تا ئەو جێگایەی پێویستە، میکانیزمی هۆکاری نابەجێ لە ژینگەی کۆمەڵایەتی وەرناگرێت لەم رووەوە شوێنێکی باش و خاوێن بۆ منداڵان پەیدا ئەکات. لە هەر کۆمەڵێکدا بێجگە لە فاکتەری بێ بەها و کۆن و، زۆر فاکتەری رێگریش هەن. ئەرکی فێرگەیە کە رێگای ئەو جۆرە هۆکارانە نەدات لەم رێگایە لە ئاست گەشەکردنی کۆمەڵگادا راوەستن. فێرگە بە هۆی هەڵبژاردنی باشترین فاکتەر و هۆکاری کۆمەڵگا، دەبێتە هۆی بەرەو پێش چوونی ئەو گەشە لەبارە. کۆمەڵگا هەرچی زیاتر گەشە بکات، زۆرتر تێ دەگات کە هەوڵی پاراستن و گواستنەوەی هەموو سەرمایەکانی خۆی و ئەو بەشەی کە بۆ داهێنانی داهاتوویەکی بەختەوەرتری پێویستن و، رێز بگرێت و بیانخاتە گەڕەوە، کە فێرگە گرنگترین هۆکارە بۆ ئەو ئامانجە.

ج- ئەرکێکی تری فێرگە ئەوەیە کە لە ناو فاکتەرە جۆراوجۆرەکانی ژینگەی کۆمەڵایەتی هاوکێشییەک پێک بهێنێت و وا بکات کە هەر کەسێک بتوانێت لە بەر بەستی و رێگری تویژ و بنەماڵە، خۆی رزگار بکات و هاوبەش و بەشدار بێت لە پەیامگەلی بەرفراوانی دەوروبەری. دەبێ بزانرێ کە گەرچی ئێمە (بەگشتی) باس لە کۆمەڵ و کۆمەڵگا



دەکەین، ئەوانە یەکەیەکی یەک رەگەز نین. واتە لە یەک قوماش نین، بەڵکو هەرکام لە کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆ بریتین لە کۆمەڵێک یان دەستەیەک، هەر بنەماڵەیەک بە دەوروبەر و دۆستانی نزیکیەوە بۆ خۆی کۆمەڵێکە- چەند منداڵ کە لە گەڕەکێک، گوندێک پێکەوە یاری دەکەن کۆمەڵێک، کۆڕێک پێک دێنن. هەر پۆل و بارەگایەک بۆ خۆیان کۆمەڵێک دروست دەکەن. بۆ نموونە زۆر وڵات: بێجگە لەم جۆرە کۆمەڵانە، خاوەنی چەندین کۆمەڵیترە وەک؛ نەژاد، چین و توێژی، دینی و ئابووری. شارێک لەگەڵ ئەوەش کە لەڕووی یەکبوونی سیاسییەوە ناوێکی هەیە و خۆی پاراستووە، بەڵام پڕە لە جۆرەها نەژاد و شێوە و رێوڕەسم و جیاوازی ئایین و داب و نەریت و ئارەزوو....

فێرگە توانای ئەوەی هەیە کە چەند شێوازی ژینگە یەکدەنگ و هاوشێوە بکات، رێوڕەسم و ئاکاری بنەماڵەیەک لە گەڵ رێوڕەسم و ئاکاری شەقام و کارگە و کۆڕە ئایینییەکان یەکسان نین.

ئەم ناسازگارییە لەوانەیە مرۆڤ تووشی دژایەتی بکات. فێرگە بۆ لەنێوبردنی ئەم کێشە و ترسانە ئەرک و وەزیفەیەتی کە ببێتە هێزێکی رێکخەر و قایم و پتەو لەو نێوانەدا.

## پوختەیەک

بۆ بوونی بەردەوام و پێشڕەوی کۆمەڵێک، دەبێ ویست و خوازیاری فیکرەی لاوان پەروەردە بکرێن. بۆ بەدەستهێنانی ئەم مەبەستە هیچ کات نابێت بیر و باوەڕ و دڵسۆزی و زانیارییەکان ڕاستەوخۆ بەوان بڵێین، بەڵکو دەبێ لەڕێگای ژینگەو دەوروبەرییەوە ئەو ویست و خوازیارییانە بێنێتەبوون. مەبەست لە ژینگەی منداڵ کۆی ئەو ئاڵوگۆڕ و ڕووداوانەیە کە لە تێکۆشانی تایبەتی ئەودا کاریگەرییان هەیە. یان باشتر بڵێین شوێنی کۆمەڵایەتی منداڵ تەواوی ئەو کار و تێکۆشانانەن کە لە ئەندامانی ئەو کۆمەڵەی ئەودا سەر هەڵدەدەن و لە هەوڵ و کۆششی ئەودا کاریگەرییان هەیە.

ژینگەی کۆمەڵایەتی هۆکارێکی پەروەردە و فێرکردنە و ڕادە و کاریگەرییەکەشی بەستراوەتەوە بەڕادەی بەشداری کردن لە نێوان تێکۆشانی تاک و کۆمەڵی، واتە دەوروبەری دێنێتەبوون. تاک بە هۆی تێکەڵبوون لە تێکۆشانی کۆمەڵێک ئامانجی دەدۆزێتەوە و لەگەڵ ڕەوش و دیاردەکانی ئاشنا دەبێت و ئامادەیی پێویست بۆ جێبەجێ کردنیان بە دەست دێنێت و لە هەست و سۆز و بەستراوەییان بە تەواوی تێر ئەبێت و ئاگای لە هەموو شت ئەبێت. مرۆڤی تازە پێگەیشتوو بە هۆی بەشداری کردن لە هەوڵ و تەقەلا کۆمەڵییەکاندا کە بەستراوە پێیەوە، خۆ بەخۆ لایەنە گرنگەکانی ژیان فێر دەبێت. بەڵام لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا ئەم جۆرە فێرکردن و پەروەردەکردنە لە خۆوە ناتوانێت پێویستییەکانی کۆمەڵگە دابین بکات. بەم بۆنەوە، فێرکردن و پەروەردەکردنی شیاو و زانستییانە دەسخۆشی شوێنێکە بۆ پەروەردەکردنی تایبەت و گونجاوە و پێویست.

ئەم جێگا تایبەتییەی پەروەردە، سێ ئەرکی بنەڕەتی هەیە: * سانا و جۆرکردنی هۆکارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی لە سەرەن و تەتڵە و بێژنگدان، * هەڵبژاردنی باشترین فاکتەرەگرنگەکانی کۆمەڵگا، * ڕێک کردن و پارسەنگ دان و زیاد کردنی مۆرە گرنگەکانی ژینگەی کۆمەڵایەتی.



## بەشی سێیەم:

## چۆنیەتی کەڵک وەرگرتن لە ئامراز و ئامێرەکان

مرۆڤ بە چاک کردن و خستنەگەڕ و کەڵک لێوەرگرتنی ئەو ڕێگە و ئامێرە هەڵگر و گواستنەوانە، هەروەها کەم کردنەوەی پاڵەپەستۆی گەرما و سەرما و نور و بەرق و دروست کردنی ئەو هەموو ئامێرە نوێیە ماشینییانە کە بەڕاستی ئەوەندە زۆر و سەرسوڕ هێنەر و کارامە و بەکارهێنانیان ئاسانە کە بە هیچ شێوەیەک وەسف ناکرێن و سەدان لاپەڕەی دەوێ کە مرۆڤ چەندە شتی بەهادار و گرنگ و ئامێری ژیانی دروست کردوون، لە ئەژمار نایەن و هەموویان بۆ کەڵک وەرگرتن و چاکسازی و خۆسازی و گەشەپێدانی کۆمەڵگاکانن کە شارستانییەت و بوونی خۆی گەشە پێ دەدات و دروستی دەکات. ڕوون و ئاشکرایە کە شارستانییەت و پێشکەوتن بە بێ ئەم ئامرازانە جێی خۆی ناگرێت و مانای نییە. بەڵام ئامێرەکانیش لە خۆیانەوە هیچ بەهایەکیان نییە، ئەگەر بە شێوەیەکی درووست و چاک کەڵکیان لێوەر نەگیردرێت شارستانیەت و زانست بەرەو پێش نابات. نموونە: (یۆنان)ی کۆن لەڕووی ئامرازی ژیانەوە زۆر دەوڵەمەند نەبوون، بەڵام چونکە ئامێرەکانیان بۆ ویست و داخوازی شایستەی کۆمەڵ بەکارهێنا، گەیشتنە قوڵایی شارستانییەتی سەردەمی خۆیان. کەوابوو، مەرجی پێشکەوتنی شارستانییەت ئەوەیە، کە کەرەسە ماددییەکان بۆ پێویستی و بەرژەوەندی کۆمەڵگا کەڵکی لێوەربگیرێت و بیانخاتە کارەوە. بەهەرحاڵ، چ لە کۆمەڵگای پێشکەوتوو و چ لە کۆمەڵگای بەربەری و دواکەوتوودا، چ لە ژینگەیەک کە مرۆڤ دەستە وەستانی سرووشت بێت و چ پێچەوانەکەی، گرنگ ئەوەیە کە ئەو

کەرەستە و ئامێرانەی مرۆڤ کەڵکیان لێوەردەگرن، لە دروست کردن و پێشکەوتنی کەسایەتی تاکەکانی کۆمەڵگادا بە تەواوی کاریگەرییان هەیە و بوار بۆ فێرکردنیان دروست دەکەن. هەر وەک ئاماژەمان پێدا، هەموو پاشماوە، یان میراتەکانی مرۆڤ ناکەونە بەر هەوێڵی کار، تاک راستەخۆ کەڵکی لێوەرناگرێت، لە ئەنجامدا پێویستە کە بەشە گرنگ و پێویستییەکان بە شێوەیەک لە شێوەکان وەک نموونە بەرجەستە بکرێت و بە تاکەکانی کۆمەڵ فێر بکرێن. پێویستی فێرکردن و فێرکردنی چاک و وانەکانی زمان و پەرتوک لێرەدا خۆی دەرئەخات، بە بێ کەڵک وەرگرتن لە زمان کە خەت و نووسراوە بەشێکن لەو، گواستنەوەی پاشماوە و میراتە پڕ نرخەکانی شارستانییەت و مەدەنییەت نایەنە دی و رەوتی خۆی ناپێوێت. لە کۆمەڵگای پێشکەوتنخوازدا، فێرکردن و پەروەردە لە بن هەنگڵی کتێبدایە، کەسێکیش کە زمانی خوێندن و خوێندەواری نەبێت، ناتوانێت بە ئاسانی و ئاسایی سوودمەند بێت لە فێرکردن و پەروەردە.

بەڵام نابێ فەرامۆشی کەین کە پەروەردە و فێرکردنی زمان، یان کتێب، کاردانەوەی خراپیشی هەیە، گەر لە کردار و وجود چاوپۆشی بکرێت و جیا بکرێنەوە، مامۆستا دەکاتە ئامێرێکی تایبەتی قسە کردنو قوتابیش بە بوونەوەرێکی مردوو و بێ وەڵام و بێ کردەوە. ئەمجۆرە پەروەردەو فێرکردنە لە هەر شوێنێکدا ئەکەونە بەر رەخنە، ئەم جۆرە رەخنانەش تەنیا لە چوارچێوەی نووسین و وتاردا دەردەکەون.

بۆ نوێسازی و پەروەردە و فێرکردنی زمان و کتێب، نابێ هەر جۆرە وانەیەکی زارەکی یان نووسراوەیی رەد بکرێنەوە، بەڵکو دەبێ ئەو وانە زارەکی و نووسراوانەش لە ژیانی مەیدانی نزیک بکرێنەوە. بۆ ئەم مەبەستە دەبێ هەنگاوی پێویست بنرێ بۆ ئاڵوگۆڕ لە نێو رێکخراوە و فێرگەکاندا و بە شێوەی دروست لە ئامرازەکان کەڵک وەربگیردرێت.



## پەروەردە و فێرکردن بۆ خۆی بەشێکە لە گەشەکردن

**١- مەرجی گەشەکردن:**

کاتێک کە ئێمە بۆ رێنوێنی منداڵان هەوڵ ئەدەینو رەنگ و رەواڵەت بە وزە و تێکۆشان ئەبەخشین، لەڕاستیدا یاسای داهاتوو دیاری دەکەین، چونکە روونە منداڵان کە ئەمڕۆ پەروەردە ئەکرێن، کۆمەڵگای سبەینێ دروست ئەکەن و بە پێی فێربوون و پەروەردەکردنیان هەڵسوکەوت ئەکەن. بەمجۆرە دەبێ بە چاوێکی باش سەرنجی منداڵ بدەین و بە شێوەی دروست داهاتوویان دروست بکەن یارمەتی گەشە کردنیان بدەین و لەڕووی هۆشەوە پەروەردە بکرێن. منداڵ لە خۆوە گەشە ناکات و لەڕووی دەرەکییەوە بە سەریدا ناسەپێت، واتە ( تەزریق) ناکرێت.

منداڵ دوو لایەنی بەرچاوی هەیە: لایەنی * قابلیەت و خۆشەویستی، *گرنگی نەدان و بێسۆزی*. لەم دوو رووەوە منداڵ هەم بە هەست و سۆز پەروەردە دەبێت هەم بە پێچەوانەوە. ماکەی بێهێزی بێچوی مرۆڤ ئاساییە، بە جۆرێک کە دەزانین منداڵی مرۆڤ لە ئاست هۆکارە سروشتییەکانەوە زۆر لاوازە و ناتوانێت لەگەڵ بەچکەی ئاژەڵدا لەم بوارەوە هاوکێش بێت. بێچوی ئاژەڵو باقی گیانلەبەران کەم و زۆر لە خۆیان رادەبینن و ئامادەییان هەیە بۆ پێش بردنی ژیانێکی سەربەخۆ، بەڵام منداڵی مرۆڤ بە بێ پاڵپشتی کەسانیتر و یارمەتی وەرگرتن بۆ گەشەپێدان، لە ئەستۆی بەجێگەیاندنی پێداویستییەکانی خۆیان بێ تواناو بێ هێزن.

منداڵ هەر لە سەرەتای لە دایک بوونیەوە « ئامادەباشی» توانای گەورەی هەیە بۆ تێکەڵاویو فێربوونی شێوەو رێورەسمەکانی کۆمەڵی.

خو و ڕەوشتی کۆمەڵایەتی منداڵ زۆر بەهێزە، بەڵام لە خۆوە ناتوانێ، دەبێ لەڕێگای گەورەکانەوە فێر بکرێن و پەروەردەبکرێن. بوونەوەرانی تازە خولْقاو و ساوا، بۆ گەشەکردن و وزە و فێربوون، دەبێ لەگەڵ ژینگەی خۆیاندا سازگار و گونجاو بن، بەڵام ئەم سازگارییەش بڕیارێکی نەگۆڕ نییە. منداڵ شتێکی، وەک مۆمی گەرم یان هەویر نییە، بە ئاسانی بە هۆی کاریگەری پاڵپێوەنەرانی دونیای دەرەکی، قاڵبێکی دیاریکراو بە خۆوە ناگرێت. سازگاری شتێکی ئاساییە، بەو واتایە کە منداڵ لە بیری تاقیکارییەکانی ژیاندا، خاڵی بە سود پەیدا ئەکات و فێر دەبێت و وەری ئەگرێت، بەم شێوەیە ڕەفتاری خۆی دەگۆڕێت، کرداری نوێ بە دەست ئەهێنێت و دەبێتە خاوەن ویستی تایبەت.

بێچوی مرۆڤ وەک هی گیانلەبەران، لەگەڵ « سروشت» واتە خۆکرد و خۆڕسک دێنە دونیاوە. شتی جیاوازیان ئەوەیە کە یەکەم: نیازەکانی سروشتی مرۆڤ بەرفراوانترە لە هی ئاژەڵ و باقی گیانلەبەران، دووەم خۆڕسکی و سروشتی مرۆڤ بەڕادەی گیانلەبەرانیتر سانا نییە، لە پەروەردە و ئامادەکاریدا کەم ڕەوتە. هەر بۆیە بەچکەی ئاژەڵان دوای ماوەیەکی کورت پاش هاتنە دونیایان، لە ئەستۆی ژیانی سەر بە خۆ دێنە دەرێ، بەڵام منداڵی مرۆڤ ماوەیەکی زۆری دەوێ بۆ گەیشتن بەم ئامانجە. لەم ڕووەوە دەتوانین بڵێین کە بێچوی گیانلەبەران لەڕووی خۆ ئامادەکارییەوە لە بەچکەی مرۆڤ بە تواناترو تەواوترن، بەڵام دەبێ بزانین ئەم سەرکەوتنە، کاتییە و زوو دەڕوات. مرۆڤ لە دەورانی منداڵییەوە لە خولی بەرزبوونەوەی سروشت و خۆڕسکی خۆیدا، ناچاری فێربوون دەبێت. فێر ئەبێت کە فێربێت، لەم ڕووەوە لێکۆڵەرەوان پێیان وایە کە هەرچی کۆمەڵگای بەشەری گەشە بکات هەرواش تەمەنی منداڵی و دەورانی گەشەکردنی درێژتر ئەبێتەوە.



**٢- واتای زانستی گەشە یان گەشانەوە لە پەروەردە و فێرکردندا:**

زانیمان کە ژیان تەنیا ڕەوتی گەشەکردنە. مرۆڤ تا زیندووە بە هەر جۆرێک بێت گەشە دەکات و دەچێتە پێش، لە هەمان کاتدا لەگەڵ جیاوازی قۆناغی تەمەنی، گەشە کردنیشی جیاواز دەبێت. مرۆڤی لەش ساغ، کەم تەمەن بێت یان بەتەمەن، بەردەوام گەشە دەکات. گەشە کردنی هەر مرۆڤێکیش لە هەر قۆناغێکدا بێ، لەگەڵ باروودۆخی دەوروبەریدا سازگاری هەیە. هەر بۆیە گەشە تەنیا لە چوارچێوەی قۆناغی منداڵیدا نییە و بەو دەورانەوە نەبەستراوەتەوە. گەر بە پێچەوانە گەشە ببەستینەوە تەنیا بە قۆناغی منداڵییەوە، ناچارین ئەو خاڵە قەبووڵ بکەین کە منداڵی تەمەنێکی بێ واتایە و خۆی بۆ خۆی نرخ و بەهای نییە و لە پێناوی ئامانجی قۆناغەکانی دواترا فیدا دەبێت!. بەم جۆرە و لەم ڕوانگەوە بە بێ سوود هەوڵ ئەدەین تا داواکاری و ویست و ئارەزووەکانی قۆناغی منداڵی لە بیر بەرینەوە و ویست و بڕیارەکانی قۆناغی گەورەیی بە فشار و دووبارە کردنەوە و کردەوەی ئامێری فێری منداڵ بکەین.

ناڕەوایە کاتێک کە ویستە سروشتی و خۆرسکییەکانی قۆناغی منداڵی لە بەرچاو نەگرینو بمانەوێ منداڵ فێری ڕەفتارێک بکەین کە بۆ زەمەنی گەورەیی دەبێت و هی داواترە. گەروابێ، یەکەم: تووشی کردەوەی پاڵە پەستۆیی و داسەپانی دەبین، دووەم: دڵنیا دەبین کە کاتێک ڕێوڕەسمی دەورانی گەورەییمان بە منداڵ فێر کرد، ئیتر قۆناغی گەشە و فێرکردن و پەروەردەکردن کۆتایی پێدێت. دەرئەنجامی ئەو بیرە نادروست و چەوتەو مانەوەی بە تایبەت لە نێو کۆمەڵی ئێمە و دەوروبەریشمان هێشتا دیارە و زۆر بەرچاوە. زۆرن ئەوانەی بەدەست ئەو کارانە دەناڵن کە هی دەورانی منداڵی نییە و منداڵەکان هەنگاویان بە سەریدا ناون و

هیچ چێژێکیان لە گەمە و یاری و خۆشییەکانی منداڵییان بەدەست نەهێناوە. و زۆرن ئەوانەی کە وا ئێستاش دەناڵێن بە دەست بەربەستکردنی گەشەی فێربوون و پەروەردەکردنیان لەگەڵ تێپەڕینی تەمەنی منداڵییان و تەرکی قوتابخانە راوەستاوە. سکاڵا و کەسەر بوونیان بەجێیە، چونکە بە هۆی یاسای چەوتی پەروەردەکردنی نادروستەوە، نەک تەنیا لە سایەی سۆز و خۆشەویستی قۆناغی منداڵی هیچیان دەست نەکەوتووە، بەڵکو نەشیان توانیوە دەورانی گەورەییشیان لەگەڵ رەوتی گەشە کردن و جموجۆڵ و گۆڕانکاریدا بگونجێنن‌و هاوئاهەنگی بکەن.

بەم شێوەیە نابێ هیچ کات لە، دوو بنەمای سەرەکی بێ ئاگا بین:

**یەکەم**- پەروەردە و فێرکردن، لە کەرەسە و ئامێرەکانی ژیان نین، بەڵکو خودی ژیانە.

**دووەم**- پەروەردە و فێرکردن رەوتێکی نەگۆڕە تا کۆتایی ژیان و تا ئەو کاتەی مرۆڤ ژیانی درێژەی هەیە.

پەروەردە و مۆچیاری منداڵ دوو خاڵی گرنگن: داواکارییە لە بارەکانی منداڵ دابین بکرێن و یاریدەدەری خواستەکانیان بن و بە چەکی زانست چەکدار بکرێن. پەروەردەکردنی منداڵ کارێکی سانا نییە و کاتی دەوێ. رێز لە منداڵ بگرن، دەست مەخەنە ناو ژیانیانەوە و خەڵوەتیان لێ تێک مەدەن.



## پوختەیەک

خوورەوشتی منداڵ لەگەڵ رێورەسمی ژیانی کۆمەڵگا یەک ناگرنەوە. لەم رووەوە دەبێ لێزانانە رێنوێنی بکرێن، رێنوێنیش نابێ بە داسەپاندن بزانن، ئەو دوانە جیاوازن. مەبەست لە رێنوێنی ئەوەیە کە ئاکار و کرداری مرۆڤ لە چوارچێوەی ئامانجێکی دیاریکراودا بگونجێنن و پەیوەندییەکی بەردەواما و بە دووی یەکدا هاتوو لە نێوان هەوڵ و تەقەلاکانی دروست بکەین. جاروبار (بەڵێ) و (نە)ی ئێمە لە کرداری کەسانیتردا کاریگەر دەبێ، ئەم کاریگەر بوونەش دەبێتە فاکتەرێک کە ئێمە بۆ ئەم جۆرە بەرگرییە گرنگییەکی بەرچاو لە خۆمان پیشان بدەین و لە کاتی رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ لاواندا بیبەینەکار و لە باقی شێوە بەرگرییەکان چاوپۆشی بکەین.

رەوشتی دروست و بەرگریش لەگەڵ (بەڵێ) و (نە)، یان بە شێوەی تر ((بڕیار و حاشا))ی توند و راست و رەوان لایەنی لاوەکی و داسەپاندنی نییە، بەڵکو لەڕووی دەروونی و هەست و هۆشەوەیە. کاتێک دەتوانین چاودێری منداڵێک بکەین کە بە شێوەیەکی (مەنتیقی) رایگرین و بە کردەوە ئاشنای بکەین بە هەموو تێکۆشانە دەستەیی و ئامێرییەکان، کاری پەروەردە و فێرکردن هەر ئەمە نییە، فێرکردن و پەروەردەکردنی زمان و کتێب گەرچی لە رێنوێنی منداڵدا بەشێکی بەرچاون، بەڵام هەردەم پێناسەکردن، زیانیشی هەیە. فێرگە بۆ ئەوەی ئەرکەکانی خۆی چاک و خاوین بە جێ بگەیەنێت، دەبێ لە زۆر لایەنەوە لە مەودایەکی بەرفراواندا لە تێکۆشانە گشتی و کۆمەڵییەکاندا منداڵ هان بدات بۆ بەشداری کردن و سوودی پێ ببەخشێت، لەم رێگایەوە ئاشنای بکات بە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان، و هەروەها توانای خۆی و ئەو ئامێر و مەودا و کەرەستانەی کە پێویستن پێیان بناسێنێت. هێزی گەشە لەگەڵ کەموکوڕی هاوڕێ و، تێکەڵن، ئەم دوانە لە قۆناغی منداڵی و مێرمنداڵیدا

بەو پەڕی پلەی بەرزی خۆیان دەگەن. ئەزمونگەری هۆکار و ئاکاری نوێیە و دەست دەگرن بە سەر ژینگەدا و کەڵکی لێوەردەگرن. خووڕەوشت لە لایەکەوە دەسخۆشی توانا و دوو پات بوونەوەی تێکۆشانەکانی مرۆڤ و لە لایەکی ترەوە بە پێچەوانەوە. خوورەوشت و ئاکارێک کە لەگەڵ بیر و سازشدا هاوکێش بن، مرۆڤ پاڵ ئەنێن بەرەو گەشە کردن و بیروڕای نوێ، بەڵام ڕەوشت و نەریتی کوێرکوێرانە یان ئامێری، رەوتی هەلدان‌و گەشە دەپچڕێنێت. چون گەشەکردن بۆ خۆی خودی ژیانە. کەوا بێت پەروەردە و فێرکردن، وەک ژیان رەوتێکی بەردەوامە و بەرهەمی ئەو پەروەردە و فێرکردنە، گەشە پێدانی منداڵانە.



## بەشی چوارەم:

**١- ئایا پەروەردە و فێر کردن دەبێتە هۆکار بۆ دەرکەوتنی توانا و بەهرەکان.؟**

یەکێک لە خاوەن بیروڕاکانی سەردەمی کۆن لە سەر ئەو باوەڕەیە کە مرۆڤ خاوەنی زۆر بەهرە و سەلیقە و توانای شاراوەیە کە هەریەکێکیان لەخۆیدا لایەن و ئامانجی تایبەتی هەیە، لە کات و قۆناغی گەشەو فێرکاری و ڕاهێناندا هێدی هێدی دێنەبوون و پەرە دەستێنن و لە تواناوە دەبنە کردەوە. هەر بەهرە و توانایەک ئەگەر بە دروستی پەروەردە بکرێت، دەگاتە ئەوپەڕی پێگەیشتن و گەیشتن بە ئامانجی خۆی. پەروەردەی دروست کاتێک جێ دەگرێت کە تواناکان دوور لە کاریگەری ژینگە، بگەنە مەبەست و وزە سروشتییەکانی مرۆڤ دەربخەن. چونکە پەرەسەندن و هاتنە کایەی (ئامادەکارییەکان) بە ئاسانی دەرناکەوێت، لەم ڕووەوە (مورەبیان) ڕاهێنەران دەبنە ئامرازی گفتوگۆ و بیروڕا گۆڕینەوە، هێنان و ڕوو خستنی گرفتەکان و وێنە و نموونەی تایبەت بۆ ئاسانکاری.

ئەمڕۆ ڕاهێنەران لە پەروەردەکردنی منداڵان‌و لاواندا کاریگەری زۆریان هەیە و پێش هەموو شت خودی ڕاهێنەر دەبێ لە هەموو ڕوویەکەوە ئامادە بێت بۆئەوەی بتوانێت نەوەیەکی چاک پەروەردە و ئامادە بکات و توانا و هێز و بیر و هزریان بە باشی بناسێت و دەربخات.

**٢- ئایا پەروەردە و ڕاهێنان لە وزەی هۆشەوەیە؟**

لە پاڵ بیروبۆچوونی سەلماندنی توانا و بەهرەکان، بۆچوونیتر هەن کە دەبێ ناوی لێبنێین ڕاهێنانی هێزی هۆشی. (بیروڕایەک لە سەر

ئەوەیە کە بەهرەکان لە خۆوە دەردەکەون خۆ تێوەردانی دونیای دەرەکی کەم دەبێتەوە. بەڵام بۆچوونیتر دەڵێ: کە مرۆڤ خاوەنی چەندین هێزی هۆشییە ئەو وزانە لە خۆیانەوە کایگەرییان نییە و دەبێ لەڕێگای پەیوەندی و تێکەڵی لەگەڵ دونیای دەرەوە فێربکرێن‌و ئامادە بکرێن، دەنا هیچ بەرهەمێک لەو وزانە نابینرێت و دەرناچێت.)

بۆ نموونە: فەیلەسووفی بەریتانی- **لاک**- کە لایەنگری ئەم بیرەیە. دەڵێ: زانستی مرۆڤ لە بەرهەمی تێکەڵاوی مرۆڤ و دونیای دەرەوەیە. – مەیدانی دونیای دەرەکی- هێزی جۆراوجۆری زەین، وەک: تێگەیشتن- بینین- سەرنج- پاراستن- پێوانە- تێکدان- پەیوەندی ئەخاتە کارەوە، بە هۆی کاریگەری ئەوانەوە کار دەکاتە سەر هەستی زانست.)

بەم شێوەیە ئەگەر فاکتەرە دەرەکییەکان هێزی زەین نەخەنە کارەوە و پاڵی پێوە نەنێن بۆ راهێنان، لێکۆڵینەوەکان کارامە و زانستییانە نابێت. هەر وەک، وەرزشکارێک گەر جەستە و ماسولکەکانی خۆی نەخاتە کارەوەو بەردەوام کاری پێنەکات و رایان نەهێنێت، لە وەرزش و کارەکانی سەرکەوتوو نابێت. هێزی زەینیش بە بێ راهێنانی شایستە لە ئەستۆی کارەکەی دەرنایەت. کە وایە کاری فێرکردن و پەروەردەکردنە و بە هۆی پەروەردەکردنی شایان هێزی زەین گەشە دەکات. مرۆڤ و هۆشی مرۆڤ لە خۆوە ناتوانێت گۆڕانکاری پێک بهێنێت گەر شوێن و ژینگە و سروشت و فاکتەرەکانی دەوروبەری گونجاو و لەبار و سازێنەر نەبن. هەروەها بەرفراوانکردن و گەشە پێدانی هۆش و زانستی فیکری و توانا و هێزی مرۆڤ بەردەوام پێویستی بە راهێنان و فێرکاری و پەیوەندی بەردەوامی دونیای دەرەکی و ناوەکی مرۆڤ هەیە، تا بتوانێت بە ئامانجەکانی بگات. فێرکاران دەبێ ئەوەندە هۆشیار بن کە بتوانن قۆناغەکانی تەمەن بناسن و هەر بەشێک ئەرکی خۆی پێ‌بسپێرن.



پەروەردە و فێرکردن وەک ژیان رەوتێکی بەردەوامە و لە هەموو پلەکانی ژیاندا درێژەی هەیە. بەڵام هەندێک کەس ئەو رەوتە بە ئامادەکارییەک بۆ ژیانی قۆناغی گەورەیی دەزانن و لەم رووەوە لە پەروەردەکردنی منداڵدا ویست و داخوازییەکانیان لە بەر چاو ناگرن و بە ناوی داهاتووی تەمەنی منداڵی، قوربانی دەدەن.

**٣- پەروەردە و فێر کردن بە شێوەیەکی دیموکراتی:**

تا ئێرە زانیمان کە پەروەردە و فێرکاری دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، کە تێکۆشانەکانی لاوانی کۆمەڵ دەخاتە سەر رێگای ویستی کۆمەڵ و رایان دەکێشێت بۆ هاوکاری لەگەڵ باقی ئەندامانی کۆمەڵگە.

کاتێک کە فێرکردن و پەروەردەکردن بە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و بە هۆکاری رێکخستنی ئەندامانی کۆمەڵگا بزانین، ناچارین دەبێ ئەوە قەبوول بکەین کە فێرکردن و پەروەردەکردنیش وەک کۆمەڵگای بەشەری، خاوەنی زۆر شێوەی جۆراوجۆرە و بنەما گشتییەکانی پەروەردەی لە هەموو کۆمەڵگاکاندا وەک یەک بەڕێوە ناچێ. لەم رووەوە هەڵسەنگاندنێک لە سەر تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگا جیاوازن و پێویستە. سیستەمی پەروەردە و فێرکردنی چاک و شیاوی سەردەم پەیوەندی بەو کۆمەڵگایە هەیە کە تێیدا بەڕێوە ئەچێ، هەروەها رادەی تێگەیشتن و زانیاری و چۆنیەتی بە کار بردنی، پەیوەستە بەو زانا و پسپۆر و مامۆستا و فێرکارانەی کە جێبەجێی دەکەن.

بە گشتی تا ئەو رادەی من ئاگادار بم چ لە رابردوو چ ئێستاش کە چەندین ساڵە بەشێک لە وڵاتی کوردستان بە گشتی ناوچەکانی دەوروبەرمان دەیانەوێ خۆیان لەگەڵ رەوتی بەرەو پێش چونی دونیاو و ئەو زانستەی کە ئەمڕۆ لە دونیادا لە بواری فێرکردن تارادەیەک چووەتە پێش و کاری پێدەکەن، نزیک بێتەوە و خۆی بگونجێنێت، بەڵام

بە داخەوە هێشتا نەک هەر لە دواوەیە، دەتوانم بڵێم سیستەمی پەروەردەیی ئێمە ئێستاش پڕ لە کەموکوڕییە و لە نێو بازنەی کۆندا ئەسوڕێتەوە و قەوانی کۆن لێدەدەن. دەلیلەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ کەمبوونی لێزان و راهێنەری راهاتوو لە نێو کۆمەڵگادا. سروشتییە کە کۆمەڵگاش لەم بوارەوە کەم و کورتی هەبوو، دوا دەکەوێ و درەنگتر دەگاتە قۆناغی لێک تێگەیشتن، کۆمەڵ زۆر بە هێواشی بەرەو پێش هەنگاو دەنێت. دیارە ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوسیستەمە خراپ و توتالیتاری و کۆنەپەرستانەی کە بە داخەوە سەدان ساڵە بە سەر کۆمەڵدا زاڵە و کۆمەڵگایان لە هەژاریدا هێشتووەتەوە، دەنا خۆ دیاردەو رەوتی تێگەیشتن و پێیشکەوتن هەر هەیە و بەردەوامە.

وەک ئاگادارین لە دونیای پێشکەوتووی رۆژئاوادا ئەو سیستەمە پێشکەوتوو دیموکراتییە تاڕادەیەکی زۆر جێی خۆی گرتووەو بەڕێوە دەچێت. لێرە لە رۆژئاوا بەگشتی و بە تایبەت- ئەوروپا، کۆمەڵگا لە سایەی سیستەمی دیموکراتی و پەروەردە و فێرکردنێکی ( سیستماتیکی) یەکڕواڵەتی زانستیانە، لە قۆناغی هەرە بەرزی خۆیدایەو هەر تاکێک خاوەن فیکرەی خۆیەتی و لە ئاست گۆڕانکاری و یاساکاندا هۆشیارە و مافی خۆی دەناسێت ولاتەکەی بە ماڵی خۆی و خۆی بە هی ولات دەزانێت، و چاویان لە یەکترە.

**٤- پێویستییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی:**

*کۆمەڵ* وشەیەک زیاتر نییە، بەڵام واتای زۆر بەرفراوانی هەیە. کۆمەڵگا یان کۆمەڵ سەدان جۆر شێوەی هەیە و تاکەکانی مرۆڤ لەڕووی پەیوەندیان بە کۆمەڵگاکانی خۆیانەوە، بە شێوە گرووپی جۆراوجۆر دابەش دەبن. لە زۆربەی کۆمەڵگا کۆن و نوێیەکاندا، مەردم- واتە خەڵک بە هۆی هۆکارەکانی وەک- زمانو دین، سوننەتو ئەخلاق،



لە دەستەی جۆراوجۆردا کۆ بوونەتەوە و، رێکخراوە؛ رامیاری و سنفی و هاوپیشەیی و ئەنجومەنییەکان و کۆمەڵی جیاوازیان پێکهێناوە. لەڕاستیدا بە پێچەوانەی بیروڕای گشتی کۆمەڵگا، یەکەیەکی لە یەک کاڵا دروستکراو و لە کەسانێک کە بۆ قازانجی گشتی هەوڵ ئەدەن نییە. عادەتەن، کۆمەڵگا پێکهاتووە لە دەستە و تاقمی جۆراوجۆر و ناسازگار و بگرە دەستە و تاقمێک وەک، قاچاخچی و دز، لەم دوایانەش رەشەکوژی و توندوتیژی و کۆمەڵ کوشتن و "تێرۆریستی"...هتد کە بە دژی قازانجی گشتی لێی دەخورن، لە خۆ دەگرێت. بەڵام هەرکام و هەر کەس لەو دەستە و تاقمانەی کە لە کۆمەڵدا هەن، بێ ئەملاولا لەو یەکەیە کەم یان زۆر بەشیان هەیە و بەشدارن، بە ئامراز و کەرەسەی زۆر بۆ پاراستنی خۆیان تێدەکۆشن، لە هەمانکاتدا لەگەڵ هەندێک لە تاقمەکانی تر پەیوەندییان هەیە. ئەم دوو هۆکارە، بوونی روویەکی هاوبەش لە نێوان ئەندامانی دەستە و هەروەها بوونی پەیوەندی نێوان ئەوان و باقی دەستەکان، لە سەر هەر جۆرە کۆمەڵ یانتاقمێک دەسەلمێنێت. بەڵام هەرچی ئەم دوو هۆکارە بە هێزتر بن، خۆڕاگری کۆمەڵگا یان تاقم و دەستە زیاتر دەبێت.

بۆ روونکردنەوەی زیاتری بابەتەکە، هۆکارە دوو جەمسەرییەکان دەخەینە بەر باس و لێکدانەوە.

أ- جەماوەری خەڵک کۆمەڵگایەک بێننە پێش چاوی خۆیان کە لە سەر بنەمای " دیکتاتۆری" زوڵم و زۆرداری بەڕێوە بچێت. بێگومان لەم جۆرە کۆمەڵگایەدا جیاوازی- مەودایەکی گەورە یان باشتر بڵێم بۆشاییەکی زۆر لە نێوان خەڵکو دەسەلاتدا پەیدا دەبێت. گوشارو توندوتیژی گرنگترین هۆکارە کە خەلک و چینی دەسەلاتدار پێکەوە گرێ دەدا، کە لە پێشدا رژێمە سەربازییەکان لەو ناوچانە، نمونەی هەرە بەرچاو بوون.

" **تالیراند**" رامیاریزانی بەناو بانگی (فەرەنسی) دەڵێ: حکوومەت دەتوانێت بە سەرە نێزە هەموو کارێک ئەنجام بدات، بەڵام ناتوانێت لە سەر سەرە نێزە دانیشیت."

ئاشکرایە لە کۆمەڵگای دیکتاتۆریدا تەنیا لەرێگای توندوتیژییەوە ناتوانرێ یەکێتی کۆمەڵگا بپارێزرێ، دەبێ ویست و خواستی هاوبەشیش دابین بکرێت. دەسەڵاتی تاکڕەو و چەوسێنەر، هەرچی بکات ناتوانێت پەیوەندییەکانی نێوان کۆمەڵانی خەڵک کە پێکەوە هەیانە، بەخۆیەوە ببەستێتەوە. چەوساندنەوە و زۆرداری دەبێتە هۆکاری دروستبوونی دوو چینی "ئاغا و بەردەست"، ئەوەش ناگونجێ ئەو دوو هێڵەی ژیان، یان باشتر بڵێم؛ کێشی ئەو دوو چینە لە بنەما و لە یەک نین.

بەم جۆرە حکوومەت لەگەڵ کۆمەڵگا، سەرەڕای هێزی سەرکوت و ترسێنەری ئاشکرا بۆ پارێزگاری خۆی، ناتوانێت بناغەیەکی دروست و پتەو دامەزرێنێت و نەلەرزێت.

کاتێک ڕێوڕەسم و بۆنەکانی خەڵک بە ئازادی نەکرێن و لە لایەن یاسای داسەپاوەوە ڕێگایان لێ بگیرێ و سزا بدرێن، هەر کەس عادەت بکات بەو کارە دیاریکراو و داسەپاوانەی کە بۆی دیاری کراوە و بە زۆرداری و خۆ نەویستی بڕوات، لە ئەنجامدا بیر و هۆش قەتیس دەمێنن و ڕێگای داهێنان و بەرزە فڕی نابیننەوە و گۆڕانکاری و پێشکەوتن ڕوونادات. ئەوەش بۆ خۆی دیاردەیەکی وا دروست دەکات کە" توێژی بن دەست، لە چوار سووکی دژوار و بەندوباری دیاریکراو و داسەپاو، دیلی ژیانێکی نەخوازراوی دەشتەکی و خۆڵ و لمی داخراو و نەزۆک و تۆز و گەرد بن و چینی دەسەڵاتدار و حاکم بە سەر سووکی و هەوەس بازی و خۆش گوزەرانی، ژیان تێپەڕکەن. ئەمجۆرە بەندوبارە بە نۆبەی خۆی، کۆمەڵگا بەرەو وەستان و مەنگی و سستی و زەبوونی ڕاپێچ ئەکات و ڕای ئەگرێت و فەرهەنگ لە گەشەکردن دەوەستێنێت، هونەرەکان دەسکرد و پڕ زەرق و بەرق دەبن، سەروەت و سامان لە



جێی قازانجی عەمەلیو کرداری، جوانپەرەستی و ئارایشخوازی دێنێتەبوون. هەروەها تایبەتمەندی لەرادەبەدەر، یەکێتی و زەقی زانست لا دەبات، عورفو تەشریفات، شوێنی پەیوەنییە مرۆییەکان دەگرنەوە."

بەڵی کۆمەڵگای نەخۆش ناڕێکوپێک نەگبەتی و چارەڕەشی زۆری لێ بەرهەم دێ و بە دواوەیە. بەڵام هەرگیز نابێ وا بیر کەینەوە کە کۆمەڵگای نەخۆش و ناڕێکوپێک تەنیا لە کۆمەڵگاکانی کۆیلەداریدا بوون، بەڵکو زۆر کۆمەڵگای نوێش گەرچی بە رەسمی و راستەوخۆ کۆیلەداری ناکەن، بەڵام لە واقیعدا لە ریزی ئەوان دان.!

کۆیلە تانیە مرۆڤ نییە کە بۆ کڕین و فرۆشتن بێت، بەڵکو وەک "**ئەفلاتوون**" دەڵێت: کۆیلە کەسێکە کە ویست و ئارەزووەکانی خۆی دیاری ناکات". واتە لە کۆمەڵگای ئێمەدا کۆیلە زۆرن، دەتوانم بە زاتەوە بڵێم تا ئێستاش ئەگەر بەم پێناسەی "ئەفلاتوون" بێت، کۆیلە نەک هەر زۆرن لە وڵاتانی ئێمە و دەور و بەریشدا، بگرە زۆربەشن!. حکوومەت-دەسەڵاتدارانی ئێمە و بگرە زۆر وڵاتی دونیاش، رەنگە تارادەیەک کۆیلەدارییان لەرووی یاساییەوە قەدەغەن کردبێت، بەڵام بە کردەوەو لە واقیعدا بە هۆی قازانجو بەرژەوەندی و سوود وەرگرتن لە کەسانێک کە دڵبەند و دڵخواز نین بە کارەکانیانەوە و لە بەروبومیشدا، واتە بەرهەم هێنانیشدا بەشدار نین، بەردە دروست دەکەنو بە خێوی دەکەن.

لەم سەردەمەی ئێمەدا و تەنانەت پێشتریش هەوڵێکی زۆر دراوە کە زانست لە ژیاندا وەک پیشە کەڵکی لێ وەربگیردرێتو کار و پیشەکان لەرووی زانستییەوە بەڕێوە ببرێن، بەڵام تەوای ئەو هەوڵانە تارادەیەک لە جیهاندا و بە تایبەت لە وڵاتانی سێیەمدا بێ ئاکام ماون. خاوەن کارگەکان کە لەم ڕێگاوە هەنگاویان هەڵگرتووە، کارێکی ئەوتۆیان بەجێ نەگەیاندووە. تانیا رەوتی کارەکانیان بەڕەواڵەتی، بە چەند قۆناغێکدا دابەش کردووە و هەر کەس کارێکیان

پێ سپاردووه، بەم شێوەیە توانیویانە تاکەکانی کۆمەڵ وەک ئامێر و کەرەسەی دەستگێڕی، دروست بکەن و لە هێزی ماسولکەکانیان کەڵکی زۆرتر وەرگرن.

ئەگەر لەڕاستیدا بمانەوێ زانست تێکەڵ بە کاری مرۆڤ بکەین دەبێ هەوڵ بدەین بۆ دۆزینەوەی ئەو پەیوەندییەی کە تاکی مرۆڤ بە کاری خۆی و سەر جەم تاکەکانیترەوە گرێ ئەدات. دەبێ بزانین چ هۆکارێکن دەبنە هۆی دروستکردنی مەیل و خواستی بە کار و چ هۆکارێکن کە ئەو لەو شێوە ئامێرە ماشینییە دەستکردە رزگار دەکەن. تاکی مرۆڤ دەبێ ئاستی کاری خۆی بناسێت و قەبووڵی بکات، تا بە مەیل و شارەزایی و کارامەییەوە کار بکات.

ب- پەیوەندی کۆمەڵگایەک لە تەک کۆمەڵگاکانیتر بە شێوەی جۆراوجۆر، توند بێت یان نەرم، پەیوەندییەکی دەرەکییە. واتە هەر کۆمەڵگایەک ناچارە بۆ پەرەپێدان و گەشە کردنی خۆی، لەگەڵ کۆمەڵگاکانیتر پەیوەندی دامەزرێنێت و بەو هۆیەوە سنورو چوارچێوەی ماددیو کۆمەلایەتی خۆی پەرە پێبدات و هێز و توانای خۆی بەرز راگرێت و بە تەواوی لە سەر پێی خۆی راوەستێت.

هەر کۆمەڵگایەک لەم پەیوەندییەدا بێبەش بێت، بنەماڵەیەک، قوتابخانەیەک، یان ولاتێک- بەرەو وەستان و لە نێو چون دەڕوات. جیا بوونەوە لە باقی کۆمەڵگاکان، بێبەش دەبێت لە گۆڕان و ئاڵوگۆڕ و نوێکردنەوە و رەنگ و رەواڵەت پێدانی ژیان لە کاروانی جیهان پاش دەکەوێت، هەروەها داب و نەریت لە سەرجەم بوارەکانی ژیاندا وشک و تاریک رادەگرێت. میللەتێک کە لە میللەتانیتر دوور کەوێتەوە و بکەوێتە پەراوێزەوە، یان قوتابخانەیەک لەگەل کۆمەڵگای بە هێز و گەورە پەیوەندی دوو لایەنەی نەبێت، درەنگ یان زوو وەک جەستەیەکی بێ رۆحی لێدێت و لە ئەرکەکانی خۆی دادەبڕێت.



لە دونیای کۆن و پێشووتردا کۆمەڵ و تاقم و میللەتان بە هۆی سنور دابڕاویو زۆر دوور لە یەکتری و نەبوونی تێکەڵاوی و هاتوچۆ، نەگۆڕ و نەگونجاو بوون. لە سەردەمانی کۆندا قەومە کۆنەکان تەنیا خۆیان بە خاوەن و شیاوی ئەم سەرزەوییە دەزانی و بە چاوی بێڕێزی سەیری میلەتانیتریان دەکرد. بەڵام خۆشبەختانە ئەمڕۆ بە پێچەوانەوە، کۆمەڵ و کۆمەڵگاکان لەم چاخەدا بەتایبەت، زیاتر لە یەک نزیک بوونەتەوە و نزیکتر دەبنەوە، پەیوەندی و هاتوچۆ و یەکتر قەبوولکردن و رێز لە یەکتری گرتن بەربڵاوتر و پەراوێزدارتر بووە.

### ٥- گەشەکردنی ویستەکانی کۆمەڵگای دیموکراتی:

ئەو هۆکارە دوولایەنانەی کە خۆڕاگری و دادپەروەری کۆمەڵگای پێوە بەستراون، واتە دیاردەی یەکێتی و هەماهەنگی ئەندامانی کۆمەڵگایەک بە یەکتری و پەیوەندی ئەو کۆمەڵگایە بە کۆمەڵگاکانیترەوە، لە کۆمەڵگایەکی دیموکراتی بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا بوونیان هەیە. دیمۆکراسی کە بنەمای، خولقێنەری گەشەکردنی زانست و پیشە و بازرگانی و ئاسانکردنی پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکانە، گرنگی و گەشە دەدات بە قازانجە هاو بەشییەکانی خەڵک، لە نێو بردنو هەموار کردنی گرێو گۆڵە رێگرەکانی نێو چین و توێژ و میللەت. کۆمەڵگای دیموکراتی لە کۆمەڵگاکانیتر زیاتر پێویستی بە پەروەردە و فێرکردن هەیە. هۆیەکەشی روونە، کۆمەڵگایەک کە دەیەوێ هەموو کەسێک یان باشتر بڵێین تەواوی دانیشتوانی لە کاروباری حکوومەت بەشدار بن، ناتوانێت چاوپۆشی لە زانستی فێرکردن و پەروەردە و بەرز کردنەوەی پلەی بیر و هۆشیان بکات. خەڵکانێک کە دەیانەوێ ئازاد بژین و لە ژێر گوشار و تەوژمدا نەبن، ناچارن دەبێ بە چەکی زانست ئامادە بن تا لە کاروباری تاکی کۆمەڵی و لە رێگا و رێبازی راست و دروست لا نەدەن. بێجگە لەوەش، دیموکراسی بە هۆی تێکدان و شکاندنی

بەربەستە نارەواکانی کۆمەڵایەتی، چەمکی تێکۆشانەکانی خەڵک گەشە پێدەداتو بوارێکی زۆر بۆ گەشە کردنیان دابین دەکات. ئەوەش بۆ خۆی وا دەکات کە، رەوتی بەرەو پێشبردنی پەروەردە و فێرکردن بسەلمێنێت. جگە لەمانە، دیموکراسی لە لایەکیتریشەوە گەشە بە قازانجە هاوبەشەکانی کۆمەڵ و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دەدات و لە روویەکیترەوە، بوار بۆ هەندێک لە کێشە ئابوورییەکان خۆش دەکات، کە دەبێتە هۆی جیاوازییەکی گەورە، تەنیا هۆکاری لە نێو بردنی ئەو کێشەیە، پەروەردە و فێرکردنە.

ئەگەر کۆمەڵگای دیموکراتی لە بوونی قۆناغی جیاوازی چینایەتی، واتە * ئاپارتاید*ی کۆمەڵایەتی نارازییە، دەبێ هەوڵ بدات تا هەموو تاکەکانی کۆمەڵ بتوانن گرنگی بە کەسایەتی خۆیان بدەن و برەوی پێبدەن، لە هەلومەرجی هاوتا و یەکساندا لە بواری پەروەردە و فێرکردن بەشدار بن. ئەگەر لەم رووەوە کەڵکی باش وەرنەگرین، مرۆڤ واتا و ئامانجو ئەنجامی کارەکانی خۆیان بەدی ناکەن و لە کۆتاییدا، بەرهەمی رەنجی ئەو بەشە گەورەیە- واتە، زۆرینە ئەکەوێتە دەستی کەمینەی بەرژەوەندی خواز، دیموکراسی لەم حاڵەتەدا بە تەواوی لە نێو دەچێت.

**٦- بیرورای "ئەفلاتوون" لە سەر پەروەردە:**

- لێرەشدا باسی بیرورای فەیلەسووفی بەناو بانگ "**ئەفلاتوون**" دەکەین یەکەمین زانایە پێویستی پەروەدە و فێرکردنی بە دەس هێناوە و بە جوانی باسی کردووە. دەڵێ: * ئەگەر ئەندامانی کۆمەڵ بە گوێرەی توانا ئامادەکاری خۆیان، کاریان پێ بسپێردرێ، هەر کام دەتوانێت بە رادیەکی زۆر بەرز، بۆ کۆمەڵگا سوودبەخش بێت...* بەم پێیە کۆمەڵگا ناتوانێت بە بێ فێرکردن و پەروەردەکردنێکی دروست، بەردەوام و راوەستاو بێت.

کەسێک دەتوانێت بە خۆشی ژیان بکات کە لە رادە و بنج و بنەوانی کارەکانی هۆشیار بێت و مەبەست و ئامانجی کارەکەی بناسێت. ئەو



جۆرەکەسانە دەبێ زەینی کامڵیان هەبێت، ئەوەش تەنیا لە کۆمەڵگای رێکوپێک و هاوکار و یەکگرتوو بە دی دێت و جێ دەگرێت. ئەگەر کۆمەڵگا لە هاریکاریو یەکبوون بێبەش بێت، زەینی ئەندامانیشی هەروا پەرێشان و شێواو دەبێت، چونکە هەر کۆمەڵگایەک بە پێی رەسم و داب و نەریت و یاساکانی خۆی، هەوڵی پەروەردەکردنی ئەندامانی ئەدات، و رێگا و رێبازی خۆی بەسەریاندا دەسەپێنێ. بۆیە گەر بمانەوێ ژیانی خۆشو ئاسایشمان هەبێت، دەبێ بە فێرکاری و راهێنانی دروست و لە بار، زەینەکانمان رووناک بکەینەوە. پەروەردە و راهێنانی دروست و زانستانە، تەنیا لە کۆمەڵگای سالم و هاوئاهەنگدا دەست دەداتو دێتە کایەوە. واتە دەبێ لە پێشدا کۆمەڵگای شایان و تێکۆشەر بە دەست بێنین و پاشان بیر لە پەروەردە و فێر کردن بکەینەوە.

زۆربەی فەیلەسووف و زاناکان لەم بوارەدا، واتە بواری پەروەردە و فێرکردن، بۆچونو بیری جیاوازو تەنانەت دژ بە یەکیان هەیە، بەڵام من لێرە زیاتر ئەو بۆچوونانەی کە نزیک و لێک دەچن باس دەکەم.

- "**ئەفلاتوون**" بۆ بناغەی کۆمەڵگای رێکوپێک، پێشنیار ئەکات کە: دەسەڵاتی بەرێوەبەری کۆمەڵگا دەبێ بە فەیلەسووفان بسپێردرێن تا بە بیر و بۆچوونی خۆیان رێگا و رێبازی خەڵک بدۆزنەوەو بە دەستەو کۆمەڵ و بە پێی ویستی خۆیان، بیانخەنە نێو کارەوە و یەکێتی و یەکڕیزی کۆمەڵگا بپارێزن. هەرچەندە لەوانەیە ئەم فکرە لە سەردەم و چاخی ئەفلاتوون و دواتریش دروست بووبێت، کە ئەو هاتووە قاڵب و چوارچێوەی بۆ تاک، دیاری کردووە و کۆمەڵگای بە خاوەنی سێ (٣) چینی جیاواز و نەگۆڕ زانیوە:

- چینی رەنجبەر- چینی پارێزەر- چینی فەرمانرەوا. گوایە کارە سەختو مەیدانییەکانی کۆمەڵگا لە ئەستۆی توێژی رەنجبەر دایە و دیل و بەندی ئارەزوو و هەوەسە، لە هۆش دوورە، بەو پێیە! توێژی پارێزەر،

هەندێک خاوەن هۆشە و بە پێی پلەوپایە، کۆمەڵگا دەپارێزێت. چینی فەرمانڕەوا تەواوی هۆشە (عەقڵی کول) و سەروەری کۆمەڵگا دەکات!.

گەرچی بنەمای فەلسەفەی پەروەردەی ئەفلاتوون لە روانگەی ئێمەوە دروستە، بەڵام بە بۆچوونی "**دەیوی**" ناتوانین ئەنجامەکانی ئەو بیر و بۆچوونانەی کە دایناون قەبووڵ بکەین. هەروەها دەڵێت: ئێمە ناتوانین ئەوە قەبووڵ کەین کە هەر تاکێک بە تەواوی بەندی چینێکە و دەبێ وابێت!. " **جان دەیوید**" کە بۆچوونەکەی جیاوازە، باوەڕی وایە کە، چەمکی هەر تاکێک بۆ گەشەکردن بەرفراوانە و ئەتوانێت بە هۆی گۆڕانکاری لە پەروەردە و فێرکردندا، ئارنگ ئارنگ کۆمەڵگا بگۆڕێت. فەلسەفەی تەربییەتی ئەفلاتوون، فەلسەفەیەکی بزوتنەوەیی و شۆڕشییە، بەڵام چونکە لە یەک بازنەدا دەوران دەخوات ئەنجامی تەواوی نییە.

**٧- فەلسەفەی پەروەردەیی چاخی هەژدەیەم لە ئەوروپا:**

لەو چاخەدا بیرو ئەندیشەی ئەوروپا بەرەو مرۆڤ- تاکخوازی رۆیشت. "**ڕوسو**" رۆشنبیری سیاسی فەڕەنسی- کە نوێنەری تاکخوازی ئەو چاخە بوو، مرۆڤی بە خاوەنی تواناگەلی فراوان دەزانی کە لە ڕوانگەی ئەوەوە، بۆ گەیشتن بە خۆشبەختی بەسە. بە باوەڕی ئەو، رزگاری مرۆڤ لەوەدایە کە لە ژیانی سنوورداری کۆمەڵایەتی بێتە دەرێ، تا توانا و دەسەڵاتی سروشتییانە و ئازادانە بێت. مرۆڤ کە بە ئازادی و سروشتی لە دایک بووە، دەبێ ئازاد بێت."

- بەرز کردنەوە و بەرز نرخاندنی مرۆڤنۆڕی چەرخی هەژدەم لەڕاستیدا نافەرمانی و نارەواییەک بوو بە سەر کۆمەڵگای پڕ بەند و باری " فیۆدالی" کە بە هۆی ترساندن و بیروباوەڕی نارەواو "خورافات" قازانج و بەرژەوەندی زۆربەی زۆری مرۆڤی دەخستە دەستی توێژی باڵا دەست.! روشنبیرانی ئەو سەردەمە بۆئەوەی کە ئەو رەوت و رێبازە ژەنگاوییەی کۆمەڵگای خۆیان ڕابماڵن و لە نێوی بەرن، سەرجەم ئەو ژیانەی



کۆمەڵگایان خستە بەر رەخنە و پێیان وابوو کە، رەوتی کۆمەڵگاکان لە رێبازی یاسایی خۆیان لایانداوە و بە هەڵدێردا رۆیشتوون.

ئەوانە هەوڵیاندا تا واتا و ناوەڕۆکی سروشت بە دژی کۆمەڵگا بێننە کایەوە. لەو رۆژگارەدا وشەی سروشت خاوەن زۆرمانای دڵخۆشکەر بوو. زانستی سروشتی بۆ ئەوەی سەرکەوێ بە سەر یەکدەندەیی و لاساری دەوڵەت و دین، بە هێنانە کایەوە یاسای ئاسایی سوود گەیاندن و نەزم و نوێ پێدان سەرکەوتن و هەماهەنگی و گەورەیی سروشتیان هێنایەڕوو. لەم رووەوە ئەم رەوتە بە بانگی پێشکەوتن و پێشکەوتن خوازی دەژمێردرا.

بە باوەڕی رۆشنبیرانی مرۆڤنۆڕی، دەبێ مرۆڤ لە کۆت و زەنجیری کۆمەڵگا رزگار بکرێت تا بتوانێت راستەوخۆ لە سروشت پەیام وەرگرێتو بە پێی یاسای سروشت گەشە بکات.

بێگومان ئەم بیروڕایە لە سەردەمی خۆیدا لەڕادەبەدەر بە کەڵک و پێشکەوتنخواز بوو. هەرچەند کاری تاکنۆڕیو داخراو لە پەیوەندی لەگەڵ ئێستادا، گرنگی ئەوتۆی نییە و لەوانەیە نادروست بێت، بەڵام نموونەی ئەو رەوت و ئاڵوگۆڕانە لەم کۆمەڵگە پێشکەوتوانەی رۆژئاوا و بە تایبەت ئەوروپا، ئەو کۆمەڵگا رۆشنبیر و پێشکەوتوانەیە کە ئەمڕۆ هەموومان بە چاوی خۆمان دەیبینین.

**٨- فەلسەفەی پەروەردەیی میللی:**

- بیروڕای " **جان دەوید**" بە پێچەوانەی بیروڕای تاکنۆڕیشە. ئەو دەڵێ: بیری پەروەردەیی مرۆڤنۆڕی سەرەڕای دژایەتییەک لەگەڵ کۆمەڵگا و دەستێوەردانی کە لە ژیانی تاکەکاندا هەیەتی، بۆچوونێکی باش و کاریگەر نییە، چونکە ئەگەر بڕیار وابێت کە هیچ کەسێک لە رەوتی گەشەی تاکدا بەشداری نەکات و هەموو شتێک بە سروشت بسپێرێت، پەروەردە و

فێرکردن بە تەواوی خامۆش دەبێت. دەبێ ڕێکخراوێکی تایبەتی هەبێت تا کاری پەروەردە و فێرکردن بگرێتە ئەستۆو بە شێوەیەکی دیاریکراو پەی بگرێت."

– بە هۆی شەڕەکانی ( ناپلیۆن) وڵاتانی یەک لەدوای یەکی ئەڵمانی ئەو کات بە ڕێبەری * **پروسی*** لە خەو هەستان و جوڵە کەوتن و هاتنە سەر ئەو باوەڕە، کە بە ڕژانی ئارەقی یەکگرتوویی جەماوەری خەڵک، یەکێتی و پلە بەرزی و سەربەخۆیی بە دەست دێنن. هەر بۆیە هەستی (ناسیونالیستی) میللیخوازی کەوتە نێو کۆمەڵگاکانی ئەڵمانی و دواتر بەرەو کۆمەڵگاکانیتریش پەرەی سەند. دەوڵەتەکانی ئەو کات بۆ بە هێزکردنی میللیخوازی و سەربەخۆیی کۆمەڵ، دەستیان دایە هۆکاری جۆراوجۆر، کە پەروەردە و فێرکردن یەکێک بوو لەو فاکتەرە گرنگانە. هەروەها هەوڵیاندا تا ڕەوتی پەروەردەیی تاکەکانی کۆمەڵ بخەنە ژێر دەستی خۆیان و بۆ خزمەتی میللی و کۆمەڵگەکەیان بەخێویانکەن.

هەڵبەت ئەم ئاڵوگۆڕە کردارییە لە دونیای زانستیدا کاریگەری هەبووە و ڕۆشنبیرانی لە سەر فەلسەفەی مرۆڤنۆڕی پاڵ پێوە ناوە بۆ کۆمەڵی و جەماوەری. هەر بۆیە فەلسەفەی مرۆڤنۆڕی (روسو) لە گرنگی خۆی کەوت و برەوی نەما.

لێرەدا فەلسەفەی گشتبین و جەماوەری (**هێگڵ**) زانای بە ناوبانگی ئەڵمانی، پەرەی سەند. ڕووداوە مێژوویەکان وایان کرد کە ڕۆشنبیران ڕێگایەکی تر بدۆزنەوە و ڕێبازێکی تر بگرنەبەر.

(**فیشتە**) و (**هێگڵ**) و دوای ئەوان (**پستالوتسی**)، پاش لێکۆڵینەوە کۆمەڵگایان بۆ پەروەردەی تاکی خاوێن زانی. وتیان: بەگشتی باوکان و دایکان و ڕاهێنەران، منداڵان هاوکێشی ڕێگا و ڕێبازی دەورانی خۆیان پەروەردە دەکەن چاودێری ڕەوت و پێشهاتەکانی دوارۆژ نین. بەڵام حکوومەت بە پێی بڕیار و یاسا، ناتوانێت لە داهاتووی کۆمەڵگا بێ ئاگا بێت،



ناچارە بە پێی ویست و داخوازییەکانی کۆمەڵگای سبەینێ پەروەردەی بکات و فێری بکات، کە لەم ڕووەوە گەشە کردنی کۆمەڵایەتی بەدی دێت.

فەلسەفەی پەروەردەی نوێ باوەری وا بوو، کە کۆمەڵگا جەستەیە و تاک بەشێکی جیانەکراوەیە لێی. کەرت، لەت، بۆ خۆی گرنگی نییە، بەڵکو گرنگییەکەی بەستراوە بە " کول" واتە گشتەوە. کە وابوو، کۆمەڵگا دەبێ تاکەکان بە شێوەیەک فێربکات کە لەگەڵ هەموو ویست و خواستەکانیاندا گونجاو و یەکگرتوو بێت و خۆشبەختی خۆیان لە شادمانی کۆمەڵگادا ببینن.

لە دونیای ئەمڕۆدا هیچ میللەتێک نییە کە دوور لە میللەتانیتر بێ نیاز بێت، هیچ کەسێک ناتوانێت ڕاستەوخۆ و بە تەواوی و بە تەنیا لە ژێر کاریگەری و فەرمانی کۆمەڵگای خۆیدا وەک پێویست بژی، چونکە زانست و بازرگانی و هونەر، بە جۆرێکی ئاسایی لە سنووری میللی تێپەڕ دەبن و دەچنە نێو دونیای ژیانی میللەتانی جۆراوجۆرەوە. لێرەدا پەروەردە و فێرکردنێک بە کەڵکی کۆمەڵگای دیموکراتی دێت کە بتوانێت ئەو گرفتە چارەسەر بکات، فاکتەرە بزوێنەرە میللی و جیهانییەکان پێکەوە ئاشتی بدات و بیانخاتە بەر هەوێڵی خۆیەوە. بۆ وەدیهێنانی ئەم مەبەستە پێویستی بە هەوڵ و کۆششی بەرفراوان هەیە. ئاشنایەتی منداڵان بەو ترس و وەهمانەی کە بریتین لە کێشە و هەرای نێوان میللەتان و شەڕە نێونەتەوەییەکان کاریگەری پێویستە. هەروەها منداڵان دەبێ بە لایەنە بەجێو باشەکانی نێو نەتەوەییش ئاشنا بن و بزانن کە سارستانییەتی ئێمە دەرئەنجامی پەیوەندی و هاوکاری نێوان میللەتانی جۆراوجۆر بوون. چنگهێنانی ئەم ئامانجە بێگومان، لە ئەستۆی پەروەرد و فێرکردنەو تەنیا لە نێو کۆمەڵگایەکی دیموکراتی و سەربەستدا جێبەجێ دەبێت و بە ئەنجام دەگات.

## پوختەیەک

پەروەردە و فێرکردن ئەمرێکی کۆمەڵایەتییە، پلە بەرزی و داخوازییە گەشە کردووەکانی پەروەردەیی هەر کۆمەڵگایەک بە ئامانجە گشتییەکانی ئەو کۆمەڵگایەوە بەندە و بێ هەماهەنگی یەکدی، بەرجەستە نابێت. کۆمەڵگای دیموکراتیک کۆمەڵگایەکە، کە پێشگیری بکات لە هاتنە کایەی دژایەتی و جیاوازی چینایەتی، قەومی، نەژادی و میللی. ئەمجۆرە کۆمەڵگایە، یەکەم، پەیوەندی و بەرژەوەندی هاوبەش لە نێوان ئەندامانی خۆی دادەمەزرێنێ، دووەم، پەیوەندی دوستایەتی هەمەلایەنە لەگەڵ کۆمەڵگاکانی تردا دروست دەکات. پەروەردە و فێرکردنی ئەم جۆرە کۆمەڵگایە دەبێ بە شێوەیەک بێت کە دانیشتوانی لە دەستوور و یاسا کۆمەڵایەتییەکاندا بتوانن بەشدار بن، هەروەها گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان بێ مەرج و پەرێشانی سەقامگیر بێت.

لە رابردودا، بنەمایەکی پەروەردە و فێرکردنێک کە بە کەڵکی کۆمەڵگایەکی دیموکراتی بێت، بە شێوەیەکی کامڵ و گونجاو بوونی نەبووە.



## بەشی پێنجەم:
## ئامانجەکانی پەروەردە و فێرکردن

### ١- ناوەڕۆکی ئامانج:

ئامانجی فێر بوون درێژە پێدانیەتی. گومانی نییە کە پەروەردە و فێرکردن لەم روانگەیەوە تەنیا لە کۆمەڵگای دیموکراتیدا دێتە دی، لە بەر ئەوەی تەنیا لەم چەشنە کۆمەڵگایەدا بوار دەدرێت بۆ گەشە کردنی بێ رادە و سنووری مرۆڤەکان.

لێرە گۆڕانکارییە لەم بەشەدا واتای ئامانج دەخەینە بەر لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی دروست؛ ئامانجی هەر تێکۆشانێک، لە نێو خۆیدا دەستەبەر دەکرێت، بەڵام ئەنجام یان کۆتایی لە دەرەوەی خۆیدا دەردەکەوێت. کەوا بوو ئامانج لەگەڵ هۆکار جیاوازی هەیە.

هەر تێکۆشانێک ئەنجامێک پێک دێنێت. بۆ نموونە: کاتێک کە با و قەرەهێڵ- گەردەلولی بیابان هەڵدەکات و خۆڵ و لم لە شوێنێک بۆ شوێنێکی تر دەباتو کۆی دەکاتەوەو جێگۆرکێیان پێدەکات، ئەو خۆڵ و لمانە بەشێک لە ئامانجی ئەو باو قەرەهێڵە نین، لەم رووەوە ئامانج نابێتە هاتن و هەڵکردنی بایەکە، بەڵکو ئەنجام یان هۆکارە.

کاتێک کە سەرنجی هەوڵ و تێکۆشانی "مێش هەنگوین" ئەدەین لەوانەیە بتوانین دەم لە ئامانج بدەین، چونکە هەر قۆناغێکی تێکۆشان خۆ بەخۆ دەگۆڕێت بۆ قۆناخێکیتر و دەرئەنجام دەگاتە کۆتاییەک.

مێشەکان شیلەی گوڵەکان هەڵدەگرن و دەیبەن و پاشان مۆمی لێ دروست دەکەن، دواتر دەیکەنە ماڵ، واتە شارۆ دەچنن. پاشان شامێش " تۆم " واتە گەرا دادەکات، لە گەراکان پارێزگاری دەکەن، تا دەبنە مێش و لەلایەن مێشە گەورەکانەوە دەپارێزرێن... بەمجۆرە، ئامانج بریتییە لە

تێکۆشانێکی ڕێکوپێک، کە قۆناغ بە قۆناغ دەچنە پێش." بە ڕاستی داستانی مێشهەنگوین سەیر و سەمەرەیە.

– با ئەوەش بزانین کە تەنیا پشت بەستن بە قۆناغەکانی تێکۆشان ناتوانێت ئامانج بە دی بێنێت، لە بەر ئەوەی ئامانج و سەقامگیری پەیوەستە بە چەند هۆکاریترەوە، کە یەکێک لەوانە پێشبینییە. ئەگەر زیندەوەرێک پێش لە دەسپێکردنی تێکۆشانی، پلە بە پلە بچێتە پێش و بگاتە قۆناغی کۆتایی و پێشبینی لە سەر کۆتایی هەبێت، دەتوانین بڵێین هەوڵی ئەو زیندەوەرە ئامانجێکی هەیە.

بۆ نموونە؛ کاتێک دەتوانین بۆ ڕەوشی پەروەردەیی، ئامانجێک بگرینە پێش، کە پێشبینی کۆتایی و دەرئەنجامەکەی ڕوون بێت. پێشبینی ئامانج دەبێتە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ بە ڕەوت و ئاراستەیەکی لە بار و گونجاو بچێتە پێش و زووتر بیگاتێ. ئەم پێشبینیە لە سێ لایەنەوە لە هەوڵ و تەقەلای مرۆڤدا کاریگەرییان هەیە.

یەکەم: – ڕێکخستنی ئامێری پێکەوەنەر بۆ گرفتەکانی ڕێگای ئامانج و ئەو ڕەوتە.

دووەم: – ڕێکخستن و ڕەدیف کردنی کەرەسەکانی کە بە ڕێکی و لە کاتی خۆیاندا کەڵکیان لێوەرگرێت. سێیەم: – خۆ بواردن لە هەڵبژاردنی ئامانجی ناڕەوا. بەم جۆرە پێشبینی ئامانج بە کردەوە و لە تێکۆشانی مرۆڤدا کاریگەری هەیە و لە هەوڵ و تەقەلای بێ هودە یان نەگونجاو، پارێزراو ڕێگە ڕوون ئەبێت. دەتوانین بڵێین کە تێکۆشانی ئامانجدار هەوڵدانێکە پەیوەستە بە بینین. تێکۆشان بۆ ئامانجێکی دیاریکراو پەیوەندە بە بینین و خەیاڵ و باقی کردەوە هۆشییەکانەوە. لە واقیعدا هۆش "عەقڵ" باس لە تێکۆشانێکە کە بەستراوە بە مەبەستو نییەت و دەرککردنی ڕاستییەکان و پەیوەندییەکانەوە.



بە قسەی ڕۆشنبیران: هۆشیار کەسێکە ڕێ و شوێنی داهاتووی پێشبینی بکات و بۆ بە ئەنجام گەیاندنیان پلانی هەبێ. هۆش، هێزێکە ئەتوانێت ئێستا و داهاتوو پێکەوە بگونجێنێت و لێکیان هەڵپێکێ.

ئەوەی بەشێوەیەک لە پەیوەندی بە کارەکانی خۆی هۆشیار نەبێت، واتە دەرئەنجامی پیشەکانی خۆی پێشبینی نەکات، لەڕاستیدا بە مرۆڤێکی گەمژە و گێژ و شێت دەژمێردرێت. کەسێک کە تەنیا بە هەستو گومانو بێ تێڕوانین لە ڕووداوەکان، پلان بۆ مەبەستەکانی دادەنێت، خاوەن هۆشێکی سالم نییە. هۆش دەخوازێ کە مرۆڤ ئارەزووەکانی بە قەزاوقەدەر نەسپێرێت، بەڵکو لە کاتی دانانی پلان، لە هۆکار و ڕووداوە دوور و نزیکەکان بکۆڵێتەوە. گەر وابێت زانستانە و بە زانایی بۆ مەبەستەکە چووە. تێگەیشتوویی " زانایی" واقعێکی سەربەخۆ لە کرداری مرۆڤدا نییە، بەڵکو ناوێکە باس لە نییەت و ئامانجێک دەکات کە پابەندی تێکۆشانێکە.

داسەپاندنی ئامانجی پەروەردەیی ناکام، لە سەر منداڵ بووە بە هۆی ئەوەی کە فێرکردن وەسیلەیەک بێت بۆ دەستەبەر کردنی بەرژوەندی داهاتووی منداڵان و ببێتە هۆی کاری ماشینی و نەزانانە و ڕەنجێنەر.

گەشەی سروشتی، شایستەی کۆمەڵایەتی و پلەی کەسایەتی و زاڵ بوون بە سەر زانیاری و بوونی هەست و زەوق، لەو ئامانجانەن کە لە قۆناغە جیاوازەکاندا هاتوونەتە کایەوە. ئاساییە هەر گەلێک بۆ قەرەبوو کردنەوەی کەموکورییەکانی کاری خۆی، چەندین ئامانجی تایبەت هەڵدەبژێرێت.

لەم بەشەدا باس لە سێ ئامانج دەکەین:

## گەشەی سروشتی، شایستەی کۆمەڵایەتی، پلەی کەسایەتی

**٢- ئاخۆ گەشەی سروشتی زامنی پەروەردە و فێرکردنە؟**

لە پێشدا ئاماژەمان بە یەکێک لە خاوەن بیروڕا گەورەکانی بواری پەروەردەیی کرد، کە **(ژانژاک روسو)**ی فەڕەنسی، خاوەنیەتی، لە سەر ئەو باوەڕەیە کە، فێرکردنو راهێنان لەگەڵ ویستە سروشتیەکان بە تەواوی دەبێ سازگار بێت. "روسو" لەم رووەوە دەنوسێت: فێرکردن و راهێنانی مرۆڤ بە یارمەتی سێ هۆکار ئەنجام دەدرێت، هۆکاری یەکەم؛ ئامادەکارییە سروشتییەکانی جەستەیی، دووەم؛ دانیشتوان و خەڵکانی دەوروبەری، سێیەم؛ ئامێرو شتەکان". روسو، هاوکاری هەر سێ هۆکار بۆ پەروەردە و فێرکردن بە پێویست ئەزانێت. لەگەڵ ئەم پێناسەشدا، سروشتی جەستەیی بە گرنگتر لە دوانەکەیتر دەزانێت و دەڵێت، جەستەی مرۆڤ بۆ خۆی رێ و رێبازێکی تایبەت بە خۆی هەیە و ئەتوانێت بە دوور لە شتومەک و مرۆڤەکان گەشە بکات.

**- روانگەی روسو بریتییە لە چەند خاڵی بەکەڵک:**

أ- کاتێک ئامانجی راهێنەر گەشەی سروشتی منداڵ بێت، دەبێ کاتێکی شیاو و باش تەرخان بکات بۆ نەشونمای ئەندامەکانی لەش و وزەپێدان و تەندروستی ئەو منداڵە.

ب- دەرکەوتنی گەشەی سروشتی منداڵ، وا دەنوێنێ کە تێکۆشانی جەستەیی و یاری و کارە مەیدانییەکان لە پەروەردە و فێرکردنی منداڵدا یارمەتیدەرە و گرنگی زۆری هەیە.

ج- راهێنەر لەڕێگای سەرنجدان بە گەشە کردنی سروشتی منداڵ، جیاوازییە سروشتیو دژبەیەکەکانی بۆ دەردەکەوێت و یەکسان تەماشایان ناکات.



د- راهێنەر تێدەگات کە هەموو بەشە جەستەییەکانو هێزی منداڵ وەک یەک کێشیان نییە و گەشە ناکەن. هەموو لە سەر ئەو باوەڕەین کە منداڵ بە ئامێری گفتوگۆ لە دایک ئەبێت و ئەو ئامێرەش لە ناو یەکێک لە قۆناغەکانی گەشەکردنیدا بۆ تێکۆشان ئامادە ئەبێت. تێکۆشانەکەی هەرچەندە سەرچاوەیەکی " غەریزی" سروشتی هەیە، بەڵام لە چوارچێوەیەکی دیاریکراوی ژینگەوە دەس پێدەکات. کاری خۆڕسکی ئامێری دەنگ بێژ، منداڵ هان ئەدات بۆ وتن و ئاخاوتن، بەڵام هیچ کات ئەو دەنگانە بە بێ یارمەتی فاکتەرەکانی دەوروبەری بە زمانێکی پوختەو پاراو و پەروەردەیی دەرناکەوێ. بەم جۆرە و لەم ڕێگایەوە دەتوانین بڵێین کە ڕێبەری و پێشەنگی ئەو کار و تێکۆشانە خاو و سروشتییە، هۆکارەکانی ژینگەن کە ئەیگۆڕن بۆ شێوەی دروست و باو و بە سوود. لە لایەکیترەوە دەزانین کە هۆکارەکانی چواردەوری مرۆڤ پتر رەنگی کۆمەڵایەتییان هەیە و ناوچە و مەڵبەندی ژیانی مرۆڤ بە تەواوی ژینگەیەکی کۆمەڵایەتییە. هەر بۆیە گەشە کردنی جەستەیی و کار و تێکۆشانەکانی منداڵ لە نێو تان و پۆی ژیانی کۆمەڵایەتی ڕەنگ دەگرێت، پەروەردە و فێرکردنی سروشتیو جیا لە کۆمەڵگا، کارێکی پوچ و بێ بایەخە.

- بە قسەی " **دەیوید**" تێڕوانینی نادروستی "**روسو**" لەم بوارەدا لێرە سەرچاوە ئەگرێ کە دەڵێ: هەرچی لە سروشتدایە باشەو هەرچی دەستی مرۆڤی بەر بکەوێت خراپ دەبێت!. بەم پێیە سەرەڕای ئەو هەموو بیروڕا چاک و هۆکارە شۆڕشگێڕانەیە کە لە تێڕوانینی ((روسو)) هەیە، پەسەند ناکرێت و قەت گەشەی سروشتی ناتوانێت ببێتە نیشانەو ئاماژە بۆ پەروەردەو فێرکردن.

**٣- ئایا مەبەست لە پەروەردە و فێرکردن بۆ شایستە و توانای کۆمەڵایەتییە؟**

گومانمان نییە کە لە کۆمەڵگای پڕ کێشە و ئاژاوەی ئەمڕۆی ئێمەدا، ژیان کارێکی دژوارە و پێویستی بە بارهێنان و راهێنان هەیە. هەر کەس بیەوێ لە کۆمەڵگای ئەمڕۆدا بە خۆشی بژێت دەبێ دوو جۆرە شایستەیی تێدا بێت:

أ- شایستەی ئابووری؛ واتە کۆمەڵگای پیشەسازی، کەسێک کە لە زانستی ئابووریدا شارەزا نەبێت ژیانی دژوارە. لەم روانگەیەوە یەکێک لە ئەرکەکانی پەروردەو فێرکردن، راهێنانی مرۆڤەکانە لە بواری زانستی ئابووریدا.

ب- شایستەی شارستانی: " لەبەر کێشە و ئاژاوەی کۆمەڵگەی ئەمڕۆدا وا پێویستە کە هەرکەس بۆ هاوبەشی لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا فێرکردن و راهێنانێکی تایبەتی بگرێتە بەر و لەو رێگایەوە ببێتە خاوەن هۆشێکی کۆمەڵایەتی و بتوانێت بە ئاسانی لە ژیانی تێکەڵاوی و گشتیدا بەشدار بێت، بۆ کەسانیتر سود بەخش بێت و لە پەیڤ و گفتوگۆ و نزیکایەتی ئەوان کەڵک و چێژ وەرگرێت.

هەرچەندە دابینکردنی ئەو دوو جۆرە شایستە کۆمەڵایەتییە کارێکی سەخت و گرنگە، لەگەڵ ئەوەشدا پەروەردە و فێرکردن ناتوانێت ئەو دوانە بکاتە نیشانەی ئامانجی خۆی. راهێنانی تایبەتی و زانستی ئابووری بۆ هەر کەسێک پێویستە. هەروەها راهێنانی کۆمەڵایەتی و شایستەی مەدەنی لەم چاخەی ئێمەدا پێویستە، بەڵام ئەگەر ئەو هۆکارانە پەسەند نەکەین، ناگەینە ئامانجێکی روون و گەشاوە. ئەگەر زیاتر گرنگی بە توانا و هێزی ئابووری بدەین، خەڵک دەبنە ئەو ئامێرانەی کە تەنیا بۆ پارە و دراو بە کار دێن و هەقدەست وەردەگرن. ئەگەریش بمانەوێ تەنیا گرنگی بە پەروەردەیی



کۆمەڵایەتی بدەین، خەڵک خۆش مەیل و ئارەزوو سۆز و تێکەڵاوی و هامۆشۆیی دەبن، بەڵام لە زۆر فاکتەری بارهێنانی مەعنەوی بێ بەهرە دەبن.

لەوەش زیاتر، بەداخەوە لە کۆمەڵگاکانی ئێمەدا بوونی زانیاری تایبەت و هەستی کۆمەڵایەتی هەردەم مەرجی سەرکەوتن نییە، ناخوازە لەو کەسایەتییانەی کە کارەکانیان لە دەس ئەدەن. دیسان زۆر لەو کەسانەی کە خاوەن توانا و بەهرەن بە هۆی ئەوەی کە لە بنەماڵەیەکی دەسکورت و هەژار و کەم داهاتن، زۆر بە دەگمەن دەگەنە پلەی بەرزی زانستی. کۆمەڵگای رۆژئاوا لەم بوارەدا زۆر گەشەی کردوە و خاوەن تواناو بەهرەکان بە شێوەیەکی ئاسایی و کامەرانی بە هاوکاری یاسا و پەروەردە و فێرکردن لە زۆر رووەوە گەر بیانەوێ، خۆیان دەگەیەننە ئامانج و قۆناغی هەرە بەرزی زانست.

**٤- ئایا ئامانج لە پەروەردە و فێرکردن، گەشەپێدانی کەسایەتییە؟**

شایستەی کۆمەڵایەتی یان گەشەپێدانی کەسایەتی ئەگەر بە واتای گەورەیی و قۆناغی بەرزی بزانین، وەک یەکن. کەسایەتییەک گەر چاک پەروەردە بکرێت دەبێتە مرۆڤێکی هەڵسورێنەری کۆمەڵایەتی، واتە وەک کەسێک کە لەڕاستیدا پلەی شیاوی ژیانی نێو کۆمەڵگا بە دەست بێنێت، قۆناغێکی بەرزی کەسایەتی بە دەست هێناوە. لە کۆمەڵگای دیموکراتی کەسایەتی بە پێی رەوتی کۆمەڵگا پەروەردە ئەبێت و بوار بۆ ململانێ و دژ کردی نییە.

دژایەتی کردن ئەمانگێڕێتەوە بۆ قۆناغی ( فیۆدالی)، خاوەنملکداریتی. و ئەزانین لە کۆمەڵگەی فیۆدالیدا تاک لە گشت، واتە لە خاس و عام جیا کراوە و بەرچاو بوون، کە پێشتر ئاماژەمان پێدا. بە کورتی، چینی باڵادەست لە نێو خێر و خۆشیدا و چینی چەوساوە و ژێر دەست، لە ژێر کارو کرداری توانا پڕوکێن بەرەوڕوون.

لە کۆمەڵگای دیموکراتی بوار بۆ ئەم دژایەتییە نیە، دەبێ لە ڕێگای پەروەردە و فێرکردنەوە لەو دوو واتایە بگەین و فێر بین. دەبێ منداڵ فێر بکەین کە ئامانجی بەرز بوونەوەی کەسایەتی بۆ خۆ بە زلزانی نییە، بەڵکو بۆ ئەوەیە کە شایستەی کرداری بەرفراوان بێت. کەسایەتی مەعنەوی کەسایەتییەک نییە کە واقعی ماددی لە بەر چاو نەبێت و قەبووڵی نەکات، بەڵکو کەسایەتییەکە لەگەڵ دونیای ماددە و کۆمەڵگا پەیوەندی هەبێت. لەم ئاستەدا منداڵ دەبێ فێر بکرێت کە ئامانجی شایستەی مەیدانی و کۆمەڵایەتی وەک کاری داهێنانی میکانیکی و دەستکردی نییە، بەڵکو ئامانجی شایان خودی شایستەیە. هەڵبەت کاڵا دەستکردەکان بۆ ئێمە زۆر گرنگن، بەڵام لەم ڕوانگەوە نابێت هیچ کات بەرهەمی کاڵای دەستکرد بکەینە ئامانجی شایستەی مرۆڤ.



## پوختەیەک

* ئامانج دەلالەت لە سەر دوایین بەشی تێکۆشانێک ئەکات کە لە نێو پلانی هۆشدایە و مرۆڤ دەخاتە سەر ڕێگای دەرک کردن و دیتنەوەی هەندێک لە ڕاستییەکان و هەڵبژاردنی بەشێک لەو کاڵا و کەرەسانەی کە بۆ ڕێگای مەیدانی پێویستن.

تێکۆشان لەگەڵ ئامانج هەوڵدانێکە، لەڕووی هۆشەوە بە ئەنجام ئەگات. ئامانج وا دەخوازێ کە مرۆڤ بخاتە هەوڵ و پێشبینی چەندین ئەنجامی جۆراوجۆر و بە یاریدەی هەندێک لەو ئامێرانەی کە هەن، لە قۆناغێکی دیاریکراودا بچێتە پێش. ئامانجێک کە لە دەرەوەی هۆشی ئەنجامدەرەوە سەرچاوە دەگرێت و لە چوارچێوەی تێکۆشانی ئەودا بەرەو ئەنجام دەگات، ئامانجێکی خۆویستی نییە، دەبێ بڵێین ئەوە ئامانجێکی داسەپاو و وشکە و بزوێنەری هۆشی ئەنجامدەر نییە و پەیوەندی بە هەوڵ و تەقەلای دەروونی ئەو مرۆڤەوە نییە، لە ئەنجامدا نەک تەنیا یارمەتی بە گڕوتینی تێکۆشان نادات، بەڵکو بەربەستیش دەبێت لە ڕەوتی بە ئەنجام گەیشتنی. ئامانجەکانی پەروردەیی بە گشتی کاتێک پیرۆز و گرنگن کە لە جێبەجێ کردندا بە ئاسانی ڕووی ڕاستی خۆی دەربخات و قۆناغ بە قۆناغ بگاتە ئەنجام. شێوازە پەروەردەییەکان فرە لایەن و بەرفراوانن.

لە نێوان ئەم ئامانجانەدا ( گەشەی سروشتی، شایستەی کۆمەڵایەتیگەورەیی کەسایەتی گرنگترن) بەڵام هیچکام لەم سێ ئامانجانە تەواو و بەس نین. - بیرۆکەی گەشەی سروشتی ئەوەیە، کە هێز و تێکۆشانە سروشتییەکانی مرۆڤ، سروشتی و لە خۆوە و بێ

یارمەتی فاکتەرە کۆمەڵایەتیەکان رەوتی گەشەکردن و ژیان بپێوێت و پابەندی یاسا و رێسا بێت، بەڵام راستییەکەی هەر ئەوەیە کە هێز و تێکۆشانە سروشتییەکان ( غەریزی)یەکان لە قاڵبێکی ژینگەی کۆمەڵایەتیدا دادڕێژرێن.

– بیرۆکەی شایستە، یان قابلیەتی کۆمەڵایەتی، پەروەردە و فێرکردن بە هۆکارێک بۆ بە کۆمەڵ راهێنانی مرۆڤ و خزمەت بە کۆمەڵ دەزانێتو لە لایەنگری تاک و مەبەست و نیاز، خۆ ئەبوێرێت.

– بیرۆکەی گەورەیی کەسایەتی، واتە گەشە کردنی تاکی کۆمەڵ لە بەرهەمی پەروەردەیی کۆمەڵدایە. بەڕاستی ئەم سێ بۆچوونە تەواوکەری یەکترین، چونکە کۆمەڵگای شایستەو دروست بە بێ گەشە پێدانی کەسایەتی بەدی نایەت، ئەم دوانەش بە ئاستی گەشە پێدانی ئامێرە سروشتییەکانی مرۆڤەوە گرێ دراون. پلە بەرزی و شایستەی کۆمەڵایەتی هێزێکە بۆ بەشداری تەواو لە کارە کۆمەڵایەتییەکان، ئەمەش شایەستەی کەسێک ئەبێت کە دروست گەشە بکات و بە دڵفراوانی و بەرفراوانییەوە لەگەڵ کەسانیتر رووبەڕوو بێتەوەو لە سەر دیاردەو هۆکارەکان دادوەری بکات. بەم شێوەیە دەتوانین باس لە پلەی بەرزی کەسایەتی بکەین، کە هێزێکە بۆ گەشە پێدان و بەردەوام راست کردنەوەی مەڵبەندی زانیاری تاک.



## بەشی شەشەم:

**١- گرنگی مەیل و ئارەزوو لە پەروەردە و فێرکردندا:**

لە رەوتی تێکۆشانی مرۆڤدا، هەر کات ئامانج و مەبەستێک بێتە کایەوە، مەیل دێتەبوون بە هێزی بزوێنەری خۆی رێگای ئامانج ئاسان دەکات. دەستەیەک قوتابی کە هەرکام بە پێی ویستی رەوتی تێکۆشانی تایبەت بە خۆیان، ئامانجێکی تایبەتییان هەیە و خاوەن یەک ئارەزووی هاوشێوە نین. لەم ڕووەوە مامۆستایەک کە بیەوێ هەموویان بەرەو ئامانجێکی هاوبەش رابکێشێت و یەک وانەی هاوبەش بە هەموویان بڵێت، سەر ناکەوێت. ئەم جۆرە مامۆستایانە دیارە لە مەیلو ئارەزوو نەگەیشتوون، وەک پێشینان باوەڕیان بەوە هەیە کە هۆش شتێکە سەربەخۆ کار دەکات، زانست لە روانگەی ئەوانەوە دەرئەنجامی داسەپاندنی هۆکارە دەرەکییەکانە لە سەر هۆش و زەین. بەڵام لەڕاستیدا زەین شتێکی سەربەخۆ و خۆکار نییە. زەین یەکێکە لەشتە شایستەو گونجاوەکانی مرۆڤ، مرۆڤ بە یارمەتی ئەم شیاوییە ئەتوانێت لە رەوتی هەرکام لە هەوڵەکانی خۆی بە پاڵپشتی پێشبینی دەرئەنجامی گونجاوی ئەو تێکۆشانە و بە مەبەستی خۆ تێکەڵ کردن لەو ڕەوتە لە بەرامبەر بزوێنەری چەندین هۆکاری هەبوو کاردانەوەی هەبێت. بۆ نموونە: نامەیەک هاتووە بۆ ئێوە، ئەم نامەیە وەجوڵەتان دەخات بۆ وەڵامدانەوەی. لە بەرامبەر دەزگای نووسین (کۆمپیوتەر) دانیشتوون، زانستانە بە هۆی فشاری پەنجە لە سەر کلیلێک، پیتێک لە سەر لاپەڕە نەخش دەکات یان سیستەمی کۆمپیوترەکە گۆڕانێک لە کەشی کلیلەکان، دروست دەکات، کە هەموو ئەو کارانە لەڕووی هۆشەوە پێک دێن. پێشبینی کارەکانی داهاتوو و خۆ تێکەڵ کردن، بنەمای تێکۆشانی زەینە. ئەگەر ئەم پێشبینییە

هۆشیارانە نەبێت و تەنیا لەڕێگای مەیل و خەیاڵاتەوە بێت، کاری زەین ڕێکوپێک بەرجەستە نابێت. بەمجۆرە، (زەین) شت نییە، بەڵکو دیاردەیەکە لە هەوڵو تێکۆشانی مرۆڤ، ڕەوتێکە بۆ ئامانج پشت بە کەرەسە دەبەستێت.

بەم شێوەیە پەروەردە و فێرکردن دەبێ بە جۆرێک بێت کە ڕەوتی تێکۆشانی زەین ئاسان و پەراوێزدار بکات. بۆ ئەم مەبەستە دەبێ وانەکانی خوێندن، وەک؛ مێژوو، جوگرافیا و بیرکاری، بخرێنە ناو تێکۆشانە سروشتییەکان و بە ئامانجە دروستەکانی منداڵەوە گرێ بدرێن، ئەگینا زانست و پەروەردە وەک ئەرکێکی دژوار ئەخرێتە بەر بێزاری و نەفرەتی منداڵان و نەزۆک دەمێنێتەوە. گرنگی زانستی مەیل، لە زانستو پەروەردەدا لێرەدایە.

**٢- ویست و پاراستن:**

* واتا و لێکدانەوەی ئەم دوو وشەیە جیاوازن، وەک: کەسێک کە کارێکی بە دەستەوەیە و سەرپەرشتی کارەکەی دەکات، یان جیاوازی نێوان یاریزان و تەماشاکەر لە گۆڕەپانێکدا، یان جیاوازی کەسێک کە لە ژێر ڕێژنەی باراندا بەرەو هەشارگەیەک رادەکات و کەسێک کە لە پشتی شیشەوە سەیری باران دەکات.

یەکێک لە ناو کاردایە و ئەویتر لێی دوورە، یەکێک لە ڕووداوێکدا بە تەواوی دڵی دادەخورپێت و یەکێکی تر لەو ڕووداوە بێ هەست و بێ لایەنە، یەکێک نیگەرانی دەرئەنجامی کارێکە و خەباتی بۆ دەکات و ئەویتر لە بناگوێیدا بێ خەمە و هەوڵی بۆ نادات.

کاتێک کەسێک لە شوێن کارێکەوەیە، یەکەم بۆ بە جێ گەیاندنی ئەو کارە هەوڵ ئەدات، دووەم بەو کارەوە بەستراوە و خەمخۆریەتی.



* لە ڕوانگەی دەروونناسی و پەروەردە و فێرکردندا لە حاڵەتی ئەم جۆرە کەسانە، وشەی " ویست" بە کار دەبەن، ئەو ویست و حەزە دەبێتە هۆکاری چەسپاندنی ئەو کەسانە بە کارەکانیانەوە، لە هەموو ڕوویەکەوە کارەکەیان دەخەنە بەر سەرنج و لێکۆڵینەوە و بە پێشبینی و داخوازی خۆیان هەنگاوی بۆ هەڵدەگرن. بەمجۆرە مەبەست لە مەیل و ویست، واتای ئامانج دەگرێتەوە. مرۆڤ بە هۆی ویست و خواستی، بۆ جێگا و ڕێگای داهاتووی ئامانجی کارەکەی، هۆگری ئیشەکەی دەبێت.

ئەتوانین بڵێین کە حەز و مەیل، بریتیە لە دوو بەش: لایەنی هۆشی، واتە گونجانو پێشبینی، ڕەوت و ڕووی ئامانجی کارە. لایەنی ئیرادە و ویست، واتە مەیل و خواست بە کار و دەسپێکی تێکۆشان. کە وایە ویست و خواست پردێکە مرۆڤ دەبەستێتەوە بە ڕووداوە دەرەکییەکانەوە.

وشەی (حەز) مەیل بەچەندین واتای جۆراوجۆر بە کار هاتووە.

أ- مەبەست لە (حەز) مەیل، بابەتێکە مرۆڤ دەخاتە جموجۆڵەوە لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا.

ب- هۆکارێکە کە کارێک یان شتێک دەخاتە نێو دەروونی مرۆڤەوە، بە بێ ئەوەی پەیوەندی بە هەوڵەکانیەوە ئەوەوە. وەک زۆری شتەکان کە ڕاستەوخۆ لە بازنەی تێکۆشانی ئێمەدا نین، بەڵام دەبنە بنەمای حەزەکانمان.

ج- مەیلوحەز، حاڵەتێکی ڕۆحییە کە لە دەروونی مرۆڤدا دروست دەبێت.

حەزی سروشتی و بەجێ بەو لێکۆڵینەوەی کە ئەیبینین، دیاردەیەکی قورسە و تەنیا لە نێو بازنەی پەروەردە و فێرکردندا بەرجەستە ئەبێت.

با بزانین واتای وشەی نەزم " دیسیپلین" چییە؟

نەزم هێزێکە کە دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ بە ئاگا بێتەوە، دەست بداتە کارەکانی و کەرەسە و ئامرازی پێویست بۆ بەجێهێنانی ئاواتەکانی

بباتە کار و لە ئاست گرفتەکاندا ڕێگای خۆی ون نەکات و پاشگەز نەبێتەوە. مرۆڤی خاوەن نەزم کەسێکە کە بە ژیری و ئارامییەوە بچێتە نێو کارەکەی و هۆشیارانە لە بەرامبەر لەمپەری کارەکەیدا خۆڕاگر بێت. سروشتییە کە لە نێوان دەسپێکو دەرئەنجامی هەرکارێک کۆمەڵێک گرفتو لەمپەری چاوەڕوان نەکراو دێنە پێش و کاتێک بەرهەمی مەبەستێک بەرجەستە ئەبێت، کە ئەو ڕێگر و بەربەستانە چارەسەر بێت و نەمێنێت. لەم جۆرە کارانەدا نەزم، زەرورەتی تەواوی هەیە، چونکە تەنیا بە نەزم و خەباتێکی هۆشیارانە ئەتوانین لە ئەستۆی گرفتە چاوەڕوان نەکراوەکان بێینە دەر. بە وتەیەکی تر " ئیرادە" بازنەی نەزمە، چونە ئیرادە لەبنەڕەتدا بریتییە لە ویستێکی هۆشیارانە بۆ پاراستنی ڕەوتێکی دیاریکراو و ڕوون.

واتە هەم نەزم و هەم ئیرادە لە سەر دوو ستون ڕاوەستاون؛ د- زانیاری لە ڕەوتی کار و پێشبینی ئامانج.

ح- ڕاوەستان لە بەرامبەر گرفتەکانی ڕەوتی کار.

**٣- پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و هەڵە و تاوانەکانی پەروەردە:**

لە کۆمەڵگای نوێدا هەموو خەڵک بۆ دابینکردنی ژیانی ئابووری و سیاسی کۆمەڵگا هەوڵ ئەدەن، بەڵام هێشتا زۆرن ئەوانەی مەیلیان لە سەر کارەکانیان نییە، چونکە زۆربەی بەرهەمی کارەکان تەنیا دەچێتە گیرفانی کۆمەڵێکی کەمەوە، هەر بۆیە زۆریان نەتەنیا بە شەوق و مەیلەوە کار ناکەن، تەنانەت لە مەبەستی کارەکەشیان ناگەن. لە ئەنجامدا خەڵک کە لە سەر پەیوەندی ناڕەوای کۆمەڵگا سەر دەرناهێنن، ڕێوڕەسمی کۆمەڵگاش پەسەند ناکەن، لە کۆمەڵگا و بڕیارە کۆمەڵایەتییەکان وەردەچەرخێن و بێ سەروبەر دەمێننەوە، لەم بوارەوە ژیانی گشتی لەگەڵ هۆش و دانایی بێگانە دەبن و هەموو بەشە کۆمەڵایەتییەکان ڕەنگی



ناهۆشیارانە بە خۆوە دەگرن، کۆمەڵێک دژایەتی لە تێکۆشانی مەیدانی و تیۆرییەکان دێنەبوون هەڵبەت ئێستا لەم چاخەدا زۆر لەو شتانەی کە باس کران، واتە زۆرێک لەو دژایەتی و نا هەماهەنگیانە لە نێو زۆر لە وڵاتانی ڕۆژئاوا و دیموکراتیدا کەم بووەتەوەو مرۆڤ زیاتر مەیل و ویست و ئارەزووەکانی خۆی بە خواست و مەیلی خۆی دەبینێتەوە، سەرەڕای هەندێک گرفتو کەموکوڕی، کارو پیشەی خۆی درێژە پێدەدات.

ئەو کەموکوڕی و نالە بارییانەی کە باس کران، لە نێو ئەو وڵاتانەی کە سیستەمی پەروەردەو فێرکردنی دروست و گونجاو لە بار نییە و ڕەهەندی کۆمەڵگا و حکوومەت بە ئاراستەی دیموکراتیدا ناڕوات، نەک هەر فراوانن، تەنانەت کۆمەڵگاکەشی بە گشتی لە تاریکی و نەزانیدا ڕاگرتووە...

تا کۆمەڵگا لە قەیرانی توێژی چەوساوە و چەوسێنەر دەرنەچێت، ژیانی کۆمەڵایەتی ناکەوێتە سەر ڕۆلی باش و کاریگەر و لە بار و گشتگیرەوە.

تا کاتێک چینی چەوساوە و ڕەنجبەر وشیار نەبێتەوە لە کار و کرداری خۆی لەوەی کە ژیان چ واتایەکی پڕ نرخ و گرانە و مرۆڤ بۆ دەبێ چەوسێنەر و چەوساوە بێت، بیروڕای ئازادو کاری خۆ ویستی نەبێت، کۆمەڵگا لە ڕەهەندی دیموکراتیدا بە یەکسانی ژیان ناگات. کەم بوونەوەی جیاوازی چینایەتی لە نێو کۆمەڵگادا دەبێتە هۆی گەشەکردنی ئەو کۆمەڵگایە.

لە کۆمەڵگای دوور لە دیموکراتیو بێ بەش لە سیستەمی پەروەردەیی، زۆربەی خەڵک هێشتا لە سەربەستی و ئازادی ئابووریدا بێبەشن. بوارێک نابیننەوە کە توانا و سەلیقەی خۆیان تێدا پەروەردە بکەن و سەرقاڵی کارێک بن کە شایستە و شیاوی خۆیان بن. بە بڕیارێکی لە ناکاو، بێ ئاگایی بیر و هۆش، تێکەڵ بە کارێک دەبن. هەڵبەت وەک باسم کرد

زۆربەی باسەکان لە سەر ئەو وڵاتانەیە کە هێشتا شنە بای ڕەوتی ئازادی و دیموکراتی و سیستەمی پەروەردەیی سەردەم تێیاندا بەدی ناکرێت، یان لەم بوارانەدا هێشتا لاوازن.

ژیانی ئابووری کۆمەڵگای ئەمڕۆ زۆربەی خەڵکی ناچار و ڕاپێچی چەندکارێک کردووە کە دەکرێ لە هەندێ جێگاش کە دیموکراتی باوە بە کردەوەیەکی بەردەیی ناو بەرین.

ئەو کێشمەکێش و ناڕەواییانەی کە سێبەری خستووەتە سەر ڕوانگەی پەروەردەییە جۆراوجۆرەکان، لەو ناڵەباری و دژایەتییانەوە سەرچاوە دەگرن کە لە نێو دەروونی کۆمەڵگادان. بۆ لە ناو بردنی ئەو ناڕەواییانە پێویستیمان بە سیستەمی پەروەردە و فێرکردنێکی پێشکەوتوو و دیموکراتی هەیە.

**٤- هزر و ئەزموون:**

*- کاتێک بڕیارێک دەخەینە بەر ئەزموون، لە لایەکەوە بە کردەوە لە سەری کار دەکەینو لە لایەکیترەوە، بە پێی پێویستیی ئەو کارە، گۆڕانێک بەرجەستە ئەکەین، لە ڕوویەکەوە لە سەر ئەو شتە یان ئەو بڕیارە کاریگەریمان هەیە و لەو لاشەوە بە پێچەوانە.

بەم شێوە ئەزموون پێکهاتەی دوو لایەنە: - کردەوە و دژ کردەوە. گەر یەکێک لەم دوو بەشە نەبێت، ئەزموون بەدی نایەت. ئەزموون بە بێ کردەوە هەرگیز بەدی نایەت، بە بێ دژکردەوەش، شتێکی بێ واتایە. تێکۆشان هۆکاری گۆڕانە، بەڵام گەر ڕەوتی تێکۆشان کاریگەری لە سەر ئەندامانی جەستە نەبێت، بێ مانا و ناڕوونە. کاتێک هەوڵەکانمان گۆڕانێک پێک دێنێت ئەو گۆڕانە لە نێو جەستەدا تیشک دەداتەوە و ئەزموون دروست دەبێت، واتە هەوڵ و تەقەلا بە جۆرێکی شایستەدار دەردەکەوێت. لەو شێوە ڕێبازانەوە فێر بوون دێتە کایەوە.



منداڵێک کە دەستەکانی پەلاماری ئاگرێک دەدات و دەسووتێ، ئەزموون وەرناگرێت، بەڵام کاتێک کە دەستی نزیکی ئاگرێک دەکاتەوە و بە هۆی گەرمای بە تینی ئاگرەکە دەستی دەکێشێتە دواوە، دەکەوێتە ئەزموون وەرگرتن. چونکە لەم کاتەدا لە واتای ئاگر تێدەگات. ئەو سووتانەش گەر هەست و هۆشی نەبزوێنێ، لەگەڵ سووتانی پارچە چێوێک جیاوازییان نییە واتە کارێکی (کیمیایی)یە، و بە ئەزموونگەری نایەتە ئەژمار.

هەندێک لە ڕوانگەکان گومانیان وایە کە زەین لە ئەندامانی جەستەدایەو ڕۆح لە شتێکیتردایە، لەم رووەوە گەر بمانەوێ تەنیا ڕۆح قەبووڵ بکەین، دەبێ لەش بێ نرخ و بێ توانا دابنێین. لێرەدا هەڵەیەکی گەورە لە پەروەردە و فێرکردن دێتەکایەوە.

أ- دەڵێن دەبێ لە کاتی فێرکردندا منداڵ نەجوڵێت وەک داری وشک کە لە سەر مێز و تەختەکانی بزمار دەدرێن. بەڵام بێ شک منداڵان بێجگە لە زەین، جەستەیەکی زیندوو و کاریگەرییان هەیە، بەم جۆرە ناتوانن پەیکەرئاسا دانیشن. گەر وا بێت درەنگ یان زوو بێزاری و بێتاقەتی و ماندوویی لە خۆ نیشان ئەدەن و لە فێربوون خۆ دەبوێرن و لێی لادەدەن. لە ئەنجامدا مامۆستا ناچارە تورە بێت و بەم جۆرەش گومانمان نییە کە توندوتێژی مامۆستا و پەروەردە و فێرکردنی زۆرەملێ، بە سوود و کاریگەر نابێت.

یەکێک لە هۆکارەکانی بەرەو پێشبردن و بەرز ڕاگرتنی فەرهەنگی یۆنانی کۆن ئەوە بووە کە یۆنانییەکان جەستەی جیا لە ڕۆح و تێکۆشانی هۆشیان جیا لە جموجۆڵی لەش، پەروەردە نەدەکرد.

ب- بەرپرسانی قوتابخانەکانی ئێمە لەگەڵ ئەوەی کە لایەنی جەستە و لەش بۆ فێربوون لە بەرچاو ناگرن، ناچارن گرنگی بدەن بە هەست و هۆش کە ئامێری هەرە گرنگن بۆ فێربوون. هەروەها هەوڵ ئەدەن بۆ

ڕاهێنانی وشک و بێ واتا بە زۆرەملی بۆ بەرجەستە کردنی شکڵ و شێوە گرتن و وتنەوەی وشەی زۆرو بە دوای یەکدا ڕیز کراو، تا هەست و ڕۆحی منداڵ ماند و ئەکەن. ئەو جۆرە ڕاهێنانە چونکە لە هەوڵ و تەقەلای خودی منداڵەوە سەرچاوە ناگرن، کاریگەری ئەوتۆیان نابێت.

بۆ نموونە: منداڵ تەنیا ناچار ئەکرێت هەوڵ بدا ئەو شتانە لەبەرکات و بیانخاتە مێشکیەوە کە لە واتا و مەبەستیان هیچ ناگات و لە دوایشدا دەبێتە هۆی هەوڵ و تێکۆشانێکی بێ ئەنجام، قوتابخانە لەم بابەتەدا لە پەروەردە و فێر کردنی ناو ماڵ دەچێتو سوود و قازانجی باش ناگەیەنێت.

بۆ نموونە: من بۆ خۆم یەکێک لەو قوتابییانە بووم لە قۆناغی سەرەتایی قوتابخانەدا، هەرچەند بە داخەوە بە زمانی (فارسی) دەمانخوێند و خوێندن بە زمانی کوردی ئەو کات قەدەغە بوو لە ناو قوتابخانە، لە ژێر فشاری مامۆستایانی فارس زمان، کە دەبوا لە ماوەی ئەوەندە- خولەک، کاتژمێر، ڕۆژ، ئەوەی مەبەستیان بوو لە بەرمان بکردایە، واتە بمانخستایە نێو مێشکمانەوە، کە دەتوانم بڵێم هەر هەموو وشەکان نامۆ بوون بۆ ئێمە، ئەگەر بە ویستی مامۆستایانیش نەبوایە چەندە لێدان و دارکاریمان دەخوارد؛! جا تۆ وەرە زمان هی خۆت نەبێت، لە زۆربەی هەرە زۆری ئەو وشە و ڕستە و چیرۆکانە حاڵی نەبیت و لە ژێر ڕەنگ و ڕووی ترشی مامۆستا و لۆمەی هاوڕێ و ترسی باوک و دایک و لێدان، لە بەریان کەینو بیانخەینە زەینمانەوە بە بێ ئەوەی هیچ کاردانەوەیەکی بە نرخی هەبێت. باوەڕ ئەکەن هەموو وانەکانی سێیەمی سەرەتایی تا پۆلی پێنجەمم وەک ئاو ڕەوان و لە بەر کردبوو، بەڵام پاش ماوەیەکی کورت هەر هەموویم لە بیر چووەوە.!

پیاوانی بە تەمەنی ئاواییەکەشمان کە لێیان دەپرسین" گوێدرێژ" چییە؟ نەماندەزانی، پێدەکەنین و دەیان وت: ئەی چیتان خوێندووە؟! کوڕە، باوکە،



خۆ من گوێدرێژم نەخوێندووە، شتێکیترم بە زمانێکیتر لە باتی گوێدرێژ خوێندووە!.

بە هەر حاڵ بە باوەڕی من ئەو جۆرە ڕەوشانە زۆر نالەبار بوون. بە خۆشییەوە ئەمڕۆ گۆڕانێکی گەورە دروست بووە و بەرەو پێش دەچێ، پەروەردە و فێر کردن زۆر گەشەی کردووە، بەڵام هێشتاش زۆری ماوە. دەبێ بە شێوەیەکی وا زانستانە و گونجاو و ئاسان ئاراستە بکرێت، کە منداڵ، و بە گشتی مێشک وەری بگرێت.

بە کورتی زەین بە بێ جموجۆڵ و کاردانەوەی لەش و جەستە، لە ئەستۆی فێربوون نایەت و کەموکوڕی پێوە دیارە. بۆ ئەم مەبەستە دەبێ لەشێکی سالم و بە جموجۆڵ هەبێت تا بتوانێت کار ئاسانی بۆ زەین بکات و شت وەرگرێت. قوتابخانەکانی ئێمە نابێ زەین و کاریگەری مێشک لە جەستە و لەش بە جیا بزانن، نابێ تەنیا گرنگی بە زەین بدەن و منداڵ بەس لە ڕێگای زەینەوە بە ڕووداو و واقعی دەوروبەر ئاشنا بکەن.

*- بۆ پەروەردە و فێر کردن، دوو ڕێگا پێویستە: شوێنی تایبەتی کە بریتییە لە ڕاهێنەر و وانە دەرسییەکان، ئەویتریان، شوێن و ژینگەی گشتییە کە بریتین لە پەیوەندی بەربڵاوی کۆمەڵایەتی کە تێکۆشانەکانی پەروەردە و فێرکردن لەوێدا دروست دەبن. ڕوونە کە ئەم دوو شتە تەواوکەری یەکترین. گەر بوار بۆ ژینگەی تایبەت نەبێت، منداڵان بە دژواری ئەتوانن سەرجەم ڕێوڕەسمی ژیان ڕاستەوخۆ لە ژینگەی بەربڵاوی کۆمەڵایەتی فێر بن. ئەگەر هەوڵەکانی منداڵ لە هیچ ڕوویەکەوە بەرەو ژینگەی کۆمەڵایەتی نەکێشرێت و پەیوەند نەبێت، ئەو هەوڵ و تەقەلایانەی کە لە ژینگەی پەروەردە و فێرکردندا بەڕێوە دەچن، بێ هودە و بێ واتا دەردەچێت. لەو کۆمەڵگا نوێیانەی کە هێشتا پەیوەندی کۆمەڵایەتی سنووردار و تەسکن، ڕێکخراوە کۆمەڵییەکانیش ئەوەندە کارامە نین کە بتوانن ئەو دوو لایەنەی ژینگە پێکەوە بگونجێنن.

منداڵان لە قۆناغەکانی تەمەنیاندا و بە تایبەت لە کاتی مێرمنداڵییاندا ڕەسمو ژیان لە گەورەکان و خزم و کەس و کاریان فێر دەبن و ئەرک و کارە تاکی و جەماوەرییەکانیان بەڕێوە دەبەن. ئەمە لە کاتێکدایە کە هێشتا ڕاهێنەر و مامۆستای سەربەخۆ هیچ کارلێکیان لەم بوارەدا نییە و وانە دەرسییەکان نەهاتوونەتە نێو ژیانی کۆمەڵگاوە. فێرکردنو ڕاهێنان بەشێکن لە تێکۆشانە گشتی و مەیدانییەکان وەک باقی هەوڵەکانیتر، سرووشتیانە بە زەوق و شەوق و خواستەوە بەدی دێن. بەڵام لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکانی ئەمڕۆ، بە هۆی بەرفراوانبوونی ڕێورەسمە کۆمەڵایەتییەکان و هاتوچۆ و تێکەڵاوی و زیاد بوونی، ڕۆژ بەڕۆژ کۆمەڵو لقی جۆراوجۆری کۆمەڵی سەربەخۆ پێکهاتوون، هەر کام لەم بەشانە بوونەتە خاوەن ڕەوش و چەندین ڕێباز تایبەتی، کە پەروەردە و فێرکردنی لەو ڕەنگ و ڕووە سادەییەی ڕزگار کردووە، کە ئەمڕۆ وانە دەرسی و تێکۆشانە ئاساییەکانی ژیانی لەخۆ گرتووە.

لە قۆناغ و هەلومەرجی سەردەمی ئێمەدا، واتە لە شەستەکان گەورەترین مەترسی پەروەرد و فێرکردن و ناخۆشترین خاڵی لاوازی بەرنامەی دەرسی ئەوەبوو، کە ڕاهێنەر و مامۆستا ڕێ و ڕەوشی خۆی لەگەڵ هی منداڵ بە هەڵە هەڵدەسەنگاند و پێکەوەی گرێ دەدان، لە کاتێکدا نێوانی منداڵێکی تازە فێربوو نوێ کارو ڕاهێنەرێکی فێرکارو کارامە، فەرقێکی زۆری هەیە. مامۆستای بە توانا کەسێکە کە سەبارەت بە کار و ئەرکەکانی خۆی لە شک و گوماندا نەبێت. ئەرکی مامۆستا تەنیا وتنەوەی وانەی دەرسی نین، ئەرکی ئەو زیاتر پەروەردە و فێرکردنی منداڵە. بەمجۆرە نابێ وانە و بەرنامەی دەرسی بە پلەی یەکەم و منداڵ بە پلەی دووەم بچنە قاڵبەوە.

- ئامانج و مەبەست و بازنەی پەروەردە و فێرکردن، منداڵە. مامۆستای بەتوانا یەکسەر نابێ لە منداڵ و دژکردەوە و هەستەکانی



چاوپۆشی بکات. دەبێ لە کاتی وانە وتنەوەدا بەردەوام چۆنیەتی هەڵوێستەکانی منداڵ لە بەرامبەر وانە دەرسییەکان بخاتە ژێر لێکۆڵینەوەی دروست و بە پلانەوە بچێتە پێش. مامۆستای شایستە دەبێ بزانێت کە ڕوانگەی خۆی لەگەڵ منداڵ یەک نییە. بەرنامەی وانەووتنەوە بۆ مامۆستا ئاشکرا و ڕوونەو وەرگیراوە، بەڵام بۆ منداڵ و لە ڕوانگەی منداڵەوە نامۆ و ناڕوون و سەر لێ شێواوە. وانەوتنەوە کە لە هەمان کات لە چاوی مامۆستا سادە و ساکار و ڕەوانە، لە چاوی منداڵەوە بە پێچ و پەنا و گرێ و جێی گومانە. هۆکارەکانیش ئەوەیە کە پەیوەندی منداڵ بە دونیای دەرەوە زۆر کەمە، لەم ڕووەوە بیری بەرفراوان نییە. بیری ئەو زیاتر ئەو شتومەکانەن کە لە چوار دەوری خۆی دەیبینێت، ماڵ و گەڕەک و شەقام و گۆڕەپانی یاری و شار و ئەو چیرۆکانەیە کە بیستویەتی و دەیبینێ.

ژیانی ڕاست و دروستی ئەو، ئەو ژیانەیە کە پەیوەستن بە هۆکارەکانی ئەو ژینگەیەی کە تێدا دەژی.

**٥- دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لە ناواخنی وانە دەرسییەکاندا*:**

تەواوی ئەو زانیارییانەی کە ئێمە لە قوتابخانەکان بە منداڵان ئەڵێینەوە، لە ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤەوە سەرچاوەیان گرتووە و بە هیممەتی ئامێرەکانی کۆمەڵ وەک: زمان و ئەزموونی دەستەیەک کە لە نەوەیەکەوە بە نەوەیەکیتر سپێردراوە. بەڵام بەشەکانی ئەو زانیارییانە لەڕووی سوود و قازانجەوە خاوەن بەهایەکی یەکسان نین. زانین و زانیاری لە سەر هەندێک لە شتەکان و فێربوون بۆ هەموو لایەک پێویستی تەواوی هەیە، بەڵام زانیاری و زانست لە سەر هەندێکیشیان لە وانە و شتەکان تەنیا بۆ پسپۆڕانە و بەس بۆ ئەوان بە کەڵکە. کاتێکیش کە ئەمانەوێ زانیاری جۆراوجۆر لە پرۆگرام و بەرنامە دەرسییەکاندا بگونجێنین دەبێ بە شێوەی ڕاست و ڕەوان هەڵیسەنگێنین و داینێین. بنەمای هەڵبژاردنی

زانیارییەکان دەبێ لە کۆمەڵگا وەربگیرێن. دەبێ بزانین کامە بەش لە زانیارییەکان بۆ زۆربەی خەڵک بە سوودن و کامەیان تەنیا بۆ زانستخواز و پسپۆڕانە. بێگومان ئەو زانیارییانەی کە لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا دەووترێنەوە، نابێ لەو بەشە تایبەت و پسپۆڕییە بێت.

* وتویانەو باشیشیان وتووە کە؛ پەروەردە و فێر کردن لە پلەی یەکەمدا مرۆیی و لە پلەی دووەم زانستی و پیشەیی بێت.* وەک پێشینان دەڵێن: بە مەلا بوون زۆر ئاسانە، بە مرۆڤ بوون گرانە*.

ئەم بنەمایە لە کۆمەڵگای دیموکراتیدا گرنگییەکی لە رادە بەدەری هەیە. لەم شێوە کۆمەڵگایەدا دەبێ تەواوی تاکەکان رابهێنرێن بۆ بەشداری کردن لە کارە جەماوەری و گشتییەکان، ئەمە کاتێک دەسەلمێ کە بواری فێرکردن لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە پەروەردە لە بوارەی پێشووی پێشبکەوێت. واتە پێش هەموو شت دەبێ منداڵ لە کۆمەڵگا و دەوروبەری خۆی بگات و فێربکرێت و پاشان بچێتە قۆناغی ترەوە، وەک پیشەیی و بازرگانی و زانستی و هتد.

لە کۆمەڵگایەک کە رەوتی کۆمەڵایەتی بە دەست چینێکی دیاریکراو و داسەپاوەیە، گەشەکردنی هەستی کۆمەڵایەتی و خەڵکی ئاسایی زەرورەتی نییە. بەڵام لە کۆمەڵگایەکی دیموکراتیدا کە نابێ هیچ چین و توێژێک بە سەر چین و توێژێکیتردا زاڵ بێت، گەشە کردنی کۆمەڵایەتی و هەمە لایەنی و گشتگیری خەڵک بۆ دامەزراندن و مانە و بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری کۆمەڵگا زۆر پێویستە.

پێڕەو پرۆگرامێک کە لە دیاردە و شتە کۆمەڵایەتییەکان بە دوور بێت، سەلماندن و ئاستی بەرزی داخوازی و ویستەکانی کۆمەڵگای دیموکراتی بە پاش دەخات و دژوار دەبێت.



## پوختەیەک

هەر خەبات و تێکۆشانێک کە ئامانجێکی بە دواوە بێت خاوەن دوو لایەنە؛ مەیل و پاراستن.

*مەیل بریتییە لە ویست و خواستەکانی مرۆڤ کە لە رێگای رووداوە یان شتێکەوە بە هۆی تەقەلاو بە کەڵک وەرگرتن لە میکانیزمی دیاریکراو بۆ لە ناو بردنی گرفتەکانی سەر رێگا، بە دی دێت و بە ئەنجام ئەگات. گرفت و سەختییەک کە لە ناو دەسپێک و دەرئەنجامی خەباتێک پێک دێت، دەبێ وەلا بنرێ. ئیرادە هۆکارە بۆ لە ناو بردنیان. ئیرادەی مرۆڤ سەرەڕای بوونی گرفتەکان دەجولێت، دیسان سور بێت لە سەر ئامانجەکەی و لە پێناویدا ڕاوەستاو بێت. *پاراستن کە هێزێکی راوەستاو و دەروونی نییە لە ئیرادەوە دروست دەبێت. ئەم دوو دیاردەیە لەڕووی پەروەردە و فێرکردنەوە گرنگی زۆریان هەیە، ئەگەر دروست بکەونە بەر سەرنج و ببرێنە کار، هەندێک لە روانگە و تێڕوانینە هەڵەکان دەردەکەون. یەکێک لەو هەڵانە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە " زەین" بە شتێکی سەربەخۆ و سروشتی دادەنێن. ئێستا زەین یان هۆش، ناوی رەوتێکی خەباتە کە بۆ بە دەستهێنانی ئامانجێک دێتە کایەوە. بەمجۆرە گەشەی زەین بەرهەمی ژینگەیەکی گونجاوە بۆ هەوڵە ئامانجدارەکان.

یەکێکیتر لە هەڵەکانی پەروەردەیی ئەوەیە کە زۆربەی- راهێنەران- وانە دەرسییەکانیان لەڕووی زەوقو سەلیقەی خۆیان، یان لە خۆیان سەرەوەتر دابین دەکەن و کاریان بە ویستەکانی منداڵەوە نییە. لەو حاڵەتەدا ئەگەر ئەو وانانە بە هەوڵ و تەقەلای منداڵەوە گرێ نەدرێن و تێکەڵ بە هەست و مەیلیان نەبێت بە ئاسانی و بە تەواوی رانایەن.

لە یەک جیا کردنەوەی پەیوەندی دوو لایەنی مرۆڤ سەبارەت بە شتێک یان بڕیارێک و کاریگەری ئەو شتە یان ئەو بڕیارە و

پێچەوانەکەی، نارێکە و ناگونجێت. پەیوەندی ئەم دوانە ئەگەر لە سەر بنەمای هۆشیاری بێت دەبێتە * فیکر- بیر*. بیرکردنەوە نەک تەنیا پەیوەندی نێوان ئەو دوو لایەنەیە و چاودێرە، بەڵکو چۆنیەتی پەیوەندییەکانیش دەگەیەنێت. مرۆڤ کاتێک بیر دەکاتەوە کە بیەوێ رووداوێک بدۆزێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە هەوڵ ئەدا تا پێشبینی بکا و لە ئامانج یان دەرئەنجامی ئەو رووداوە بکۆڵێتەوە. پێشبینی ئامانج یان ئەنجام، ئێمە دەخاتە بەردەم هەست و گومان و هێما کردن و دەست دەکەین بە لێکۆڵینەوە و جموجوڵ بۆ دۆزینەوەی هۆکارە پەیوەنددارەکان و ئامادەکاری بۆ دەکەین.

هەر جۆرە بیرکردنەوەیەک دەبێتە- * زانایی* بەڵام هیچ زانستێک نەگۆڕ و تەواو کۆتایی نییە، بەڵکو قۆناغێکە لە قۆناغەکانی بێ ئەژماری بیرکردنەوە. وانە دەرسی و فێرکارییەکان خۆی لە بنەڕەتدا واتاگەلێکن کە لە ژیانی کۆمەڵاتییەوە پێک هاتوون، بە هۆی بەردەوام بوون و نوێ بوونەوەی کۆمەڵ، لە نەوەی پێشووەوە بۆ نەوەی پاشتر، یان باشتر بڵێم، لە نەوەی کۆنەوە بۆ نەوەی نوێ دەگوێزرێتەوە. هەرچەند کۆمەڵگا گەورە و پڕ پێچ و پەنا بێت، رادەی داخوازی و داواکارییەکان زۆرتر دەبن، لە ئەنجامدا گواستنەوەشیان دژوارتر دەبێ.

بە نەمانی ئەو تەم و مژ و گرفتانە، واتا و مەبەستی ژیانی کۆمەڵایەتی دەکەوێتە ژێر تیشکی هەڵسەنگاندنو نەزم و نوێ بوونەوە، دەبنە دەرسی لە ناو فێرگەکاندا. بەڵام فێرگە نابێت ئەوەندە لە مەبەست و وانە کۆنەکانی کۆمەڵگا قووڵ بێتەوە کە مانای راستەقینەی ئەزموونە شاردراوەکانی منداڵ لە بیر بکات. بۆ سەقامگیر کردن و رێگای دروست، دەبێ مەواد و وانەی دەرسی تێکەڵ بە هەوڵ و تەقەلای منداڵ بکرێت و کاتێک منداڵان سەرگەرمی تێکۆشانە کۆمەڵایەتییەکانی خۆیانن، کەم کەم زانیاری بخرێتە پێش دەمیان و بە زانست و پیشەکان ئاشنایان بکەن.



## بەشی حەفتەم:

### ١- گرنگی جموجۆڵی جەستەیی لە پەروەردە و فێرکردندا:

لە پێشوودا، واتە چەند دەیە بچینە دواوە، راهێنەران و مامۆستایان پێیان وابوو کە منداڵ لە ناو قوتابخانەدا پێویستی بە یاری و بەکارهێنانی جموجۆڵی جەستەیی نییە، گوایا لە دەرەوەی قوتابخانە و کاتی پشووی درێژی ماڵدا یاری تێروتەسەل دەکات! دەیانگوت کە لە کاتی قوتابخانە یاری کردن شتێکی زیادەیە و کاتی خوێندن و فێربوون دەگرێت، بەڵام پاشان و بە پێی تاقیکردنەوەکان و لە روانگەی دروونناسەکانەوە تەنانەت نەک هەر جموجۆڵ و یاری کردن باشە، بەڵکو زۆریش پێویستن کە بەشێکی کات لە قوتابخانە تەرخان بکرێت بۆ ئەوەی منداڵان بتوانن جەستە و ئەندامانی لەشی خۆیان بە کار بێنن و یاری پێبکەن. ئەمەش ئەوەی سەلماندووە کە جموجۆڵ و یاری زیاتر توانا و هێز دەبەخشێت بە زەین و هۆش و ئەندامەکانی جەستە، بۆ ئامادە بوون و باشتر وەرگرتن. لەم رووەوە هەم زیاتر یەکتری دەناسن و دەبنە هاوڕێو هەمیش لە مامۆستا و راهێنەران زیاتر نزیک ئەبنەوە و مامۆستایان ئەتوانن لەم رووەوە توانا و هێز و هزر و هۆشی منداڵان بناسن.

### ٢- هەوڵ و تەقەلای بە جێ:

کارە مەیدانییەکان بۆ منداڵان، جۆراوجۆرن. بۆ نموونە دەکرێ هان بدرێن و بەرەو چەندین کار، وەک؛ - باخەوانی، چێشت لێنان، دروومان، چاپ، رۆژنامەگەری، کاری دەستی، چنین، وێنەکێشان، پەیکەرسازی، کاری هونەری، گۆرانی، شانۆ، بێژەری، چیرۆک، وتن و نووسین...

یان منداڵان هاندەین کە بە پەڕە و مقەوا و چێو و چەرم و گڵولم و هەویری تایبەت و زۆر شتیتری ژیکەڵە و سەیر دروست بکەن کە بتوانن رۆژانە بەکاری بهێنن، بۆ ئەوەی هەم بێزاری و ماندوویی مێشک و لەشیان دەرکەن و هەمیش ئەندام و جەستەی خۆیان کارامە بکەن بۆ زیاتر فێربوون و ئاشنا بوون بەو شتانە. لەم ریگایانەوە نەوەی ئەو کۆمەڵە بەختەوەر دەبێت و کۆمەڵیش لە نەهامەتی و دواکەوتوویی رزگار دەکەن، بە مەرجێک ئەوانەو لەوانەش زۆرتر پێکەوە بە کار بهێنرێن و لە ژێر چاودێری مامۆستاو راهێنەری باش و کارامە و بە ئەزموون جێبەجێ بن، ئەو کات داهاتووی کۆمەڵگاش گەشاوەترو زێڕینتر دەبێت.

– بە کورتی، ئەزانین کە زانستی مرۆڤ هەر لە سەرەتای ژیانیدا بۆ خۆی لایەنی کاریگەریی هەبووە و یەکەمین زانیارییەک کە منداڵ لە بواری خۆی و جیهان بە دەستی ئەهێنێت، لە ئەنجامدانی ئەرکەکانیەتی. لەم رووەوە دەبێ بەرنامەکانی پەروەردە و فێرکردن بە جۆرێک سادە و رەوان بێت کە، بتوانرێ منداڵان لە چۆنیەتی شتومەک و ئامێر و یاساکانی دەوروبەری ئاشنا بکرێن و بەرەو هاوکاری و ژیانی کۆمەڵی راکێشرێن.

جیاوازییەک کە خەڵک لە نێوان کار و یاریدا دایدەنێن، ریشەی ئابووری هەیە، ئەلێن کار تەقەلایەکە، کە ئامانجی هەیە و ئامانجەکەی لە خۆیدا بەرژەوەندییە، بەڵام یاری، جموجۆڵێکە بێ ئامانجو بێسوودە!

ئەم جیاوازییە لە ڕوانگەی دەروونناسییەوە دروست نییە. یاریش وەک کار خاوەن ئامانجە و ئامانجەکەشی بە هۆی کاریگەری خەیاڵ و هەست و سۆزەوەیە، بۆیە ئاسانتر لە ئامانجی کار دێتە پێش چاو.

تەواوی تێکۆشان و هەوڵەکان لە سەرەتای ژیانی مرۆڤدا وەک یارییە، وردە وردە بەشێکیان جێگای کار دەگرنەوە. کار بە واتای خۆی ناخۆشە و خاڵی بەرامبەری یاری نییە. هۆی ئەوەی کە خەڵک ئەم دوو شتە دژ بە یەک دەزانن ئەوەیە، کە لە کۆمەڵگای شارستانیدا، بەشێکی



کار لە ریگای ناچاری یان زەبر و زۆرەوە دەبێت و لە زەوق و ویست و خەیاڵ و خواست و سۆز بەدوورە. دەسەڵاتدارانی نێو کۆمەڵ کە خۆیان کار ناکەن، رەوتی کارەکانیان لە دەستدایە و ئامانجی کارەکان دەستتنیشان ئەکەن، بۆیە دەتوانین بڵێین لێرەوەیە کە هەژاران و بێ دەسەڵاتان بۆ بژێوی خۆیان بە ناچاری و بە زۆر دەبنە خزمەتگوزاری چینی باڵادەست و دەچنە ژێر باری ئەو کارانەی کە بۆیان واتا و بنەمایەکی ئەوتۆی نییە و جێبەجێشی دەکەن. لە ئەنجامدا پابەند بەو کارانە نابن سۆزو هەست نیشان نادەن و بە پێچەوانە، هەست بە بێزاری و تورەیی زۆر دەکەن و تەنیا وەک دەزگا و ئامێر، کارەکان ئەنجام ئەدەن کە ئەوەش دەبێتە تێکۆشانێکی بێ ئامانج و نا بە دڵ.

بەم شێوەیە ئەگەر گۆڕان لە کۆمەڵگادا روونەدات و بواری پەروەردە و فێر کردن گەشە نەکات، مرۆڤ خۆی نەناسێت و هەست بە بوونی خۆی نەکات، جیاوازییەکان نەبینێت و چینی چەوساوە و چەوسێنەر جیا نەکاتەوە، وا بزانێت کە ئەو هەر بۆ رەنجدان و چەوسێنەر بۆ سەروەری خولقاوە، رزگار نابێت و بە دوور دەبێت لە ژیانی بەختەوەری و سەربەستی. مرۆڤ دەبێ ئەوەندە شارەزا بێت کە زوو هەست بە جیاوازییەکان بکات و بیانخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

### ٣– چەمک و پەراوێزی تەقەلاکانی منداڵ:

* لە نێوان تێکۆشانێکی بێ‌واتا و واتادار جیاوازی هەیە. " کاتێک ئەستێرەناسێک و منداڵێک لە پشتی دووربینێکەوە سەیری ئاسمان و ئەستێرەکان ئەکەن، هەردوو بە رەواڵەت جم و جۆڵێکی جەستەیی هاوشێوە پیشان ئەدەن، بەڵام تێکۆشانەکان لە روانگەی مەبەستدا یەکسان نین. سەرنجی منداڵەکە لە قاڵبی جموجۆڵی جەستەییدایەو بێ ئامانج و واتایە، کە چی ئەستێرەناسەکە بە پێچەوانە مەبەست و ئامانجی روونی هەیە لەم رووەوە."

مرۆڤ پاش ئەوەی کە ئاشنا بوو لەگەڵ ڕووداوەکانی دونیا و کردەوە و کارەکانیدا، شیکارێک دەکات و بە بەشێکدا دەچێتەوە، ئامادەی وەرگرتنی زانیاری دەبێت کە لەلایەن کەسانیترەوە وەک پەیام وەریان دەگرێت یان پێی دەدەن. لێرەدا دەبێ هەرکام واتای خۆی پێ ببەخشێت و پەراوێزی زەینی خۆی پێ بەرفراوانتر بکات. مرۆڤ هەرچی بە دوای زانیاری و زانستدا بێت، بۆ وەرگرتن ئامادەتر و بە ئەزموونتر ئەبێت. لەم چەمکەوە زانستی مرۆڤ کۆتایی پێ نایەت. بەڵام گەر زانستێک کە بە مرۆڤ ئەدرێت، تێکەڵ بە جموجۆڵ و هەوڵەکانی نەبێت و هەزم و جەزبی نەکات، بێ شک دەبێتە سەروار و گرفت لە سەر هۆش و زەین، بە ئاراستەی بوارەکانی زانستدا ناچێت.

تایبەتمەندی ئاکامی باشی هەوڵ و تێکۆشانەکان، یان باشتر بڵێم؛ هەرکام لە ئەزموونەکان ئەمرێکی بزوێنەرە و بێ ئاگا لەخۆ دەچێتە قاڵبی ئەزموونێکی ترەوە و مرۆڤ ئەخاتە جۆش و خرۆش.

مێژوو و جوگرافیا زانستێکن کە مرۆڤ بە خۆی و سروشت و دەوروبەری فێر ئەکات و واتای تایبەتی و چوار لایەنەی تێکۆشانی ئەو دەگۆڕێت بە مانا و واتایەکی گشتی و بەربڵاو. مرۆڤ بە فێربوونی جوگرافیا شوێن و جێگای دروست و لەبار بۆ کار و تێکۆشانی دەدۆزێتەوەو دەستنیشانیان دەکات. هەروەها مرۆڤ بە فێربوونی مێژوو، زاڵ ئەبێت بە سەر تێگەیشتنی تێکۆشانەکانی پێکهاتەی مرۆییەوە. چونکە مێژوو زانستێکە کە بریتییە لەو پێشهاتانەی کە لەسەر چین و توێژەکانی کۆمەڵ بە دەست هاتوون و وەرگیراون. هۆکاری ئەو ڕووداوانەیە کە مرۆڤ فێری ئاداب و ڕێوڕەسمی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵی و ڕێکخراوی دەبێت.



**٤- پەیوەندی و کارلێکی مێژوو و جوگرافیا:**

لە پێشدا و دەتوانم بڵێم ئێستاشی لەگەڵ بێت، هەرچەندە من بۆ خۆم بەگشتی لە وڵات و، ناوچەوە دوورم، کە ئەو دابڕانەش تا ئێستا زیاتر لە ٢٦ ساڵە و بە داخەوە لەوانەیە درێژتریش بێتەوە، سەبارەت بە وانە وتنەوە و چۆنیەتی وانەکان و نا هەماهەنگییان لە قوتابخانەکاندا جیاوازی زۆریان هەیە. تەنانەت دەتوانم بڵێم زۆری لە مامۆستا و ڕاهێنەران ئەو دوو وانەیەی کە لە سەرەوە باسکران بە جیا دەڵێنەوە. واتە مێژوو بە جیا لە جوگرافیا، یانی ڕووداو و پێشهاتەکۆمەڵایەتییەکان بە جیا لە ژینگە و سروشت ئەزانن. هەر بۆیە قوتابی لەم بوارانەوە کەم مەیل دەبن و تەنیا لە بەر ڕازیبوونی مامۆستا، داواکارییەکان بە گوشار و زەخت ئەخەنە زەینیانەوە کە ئەوەش لە دوای ماوەیەکی کورت لە بیر ئەچینەوە. *

گۆڕان لە سەر ئاستی چونیەتی وانە وتنەوە، چۆن وتنەوە، کێ دەیڵێتەوەو بە چ ئاراستەیەکدا، زۆر کەم کراوە بە باوەڕی من.

لە بەرامبەر ئەو ڕەوتە نادروستە چەند شت پێویستن باس بکرێن:

أ- مێژوو و جوگرافیا هۆکاری بەرفراوانی زەین نین، بەڵکو هەر وەک وتمان ئەم دوو زانستە، تاکی مرۆڤ گرێ ئەدات بە زۆری پەیوەندییەکان ناو کۆمەڵ و ژینگەی سروشتییەوە و واتا و ئامانجەکانی قوڵ و بەرفراوان ئەکات.

ب- مێژوو و جوگرافیا ناتوانن لە یەک جیا بن و هەریەکەیان بە تەنیا وەک وانە لە قوتابخانە بووترێنەوە، چونکە قاڵبی کۆمەڵایەتی و ژینگەی سروشتی مرۆڤ سەر بەخۆ نین. ڕووداوە مێژووییەکان لە داوێنی سروشتەوە سەر هەڵ دەدەن و خۆ دەنوێنن و ژینگە و جوگرافیاش لە دەستێوەردانی مرۆڤ بێبەش نەبوونو بەدەر نین. کەوابوو، بۆ تێگەیشتن لە جیهان و مرۆڤ، لێکۆڵینەوە و بەرنگار بوونەوە و

دەستێوەردانی بەردەوامی کۆمەڵگا و سروشت، پێویستی هەیە. ئەم لێکۆڵینەوەیە کاتێک بە ئەنجام ئەگات کە خوێندنەوە و وتنەوەی ئەو وانە و بەشانە پێکەوە بن و بە یەکەوە ببەسترێن. مێژوو پێویستی بە جوگرافیا هەیە، لە بەر ئەوەی جموجۆڵو هەروەها بنەمای ژیانی کۆمەڵایەتی لە ناخی سروشتدا پێک هاتووە، شارستانییەت و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی لەوە دایە لە سروشت بگەیت و بە سەر بەشە گرنگەکانیدا زاڵ بیت. جوگرافیا نیازی بە مێژوو هەیە، چونکە شکان و سەرکەوتن، ناکامی و شادومانی، و کارلێکی چۆنیەتی ژیانی مرۆڤ لە وەرگرتنی هێزی سروشت و گۆڕانی، پێک هاتوون. ئەگەر گرنگی بەو دوو بەشە نەدرێن پێکەوە، یەکیان وەک زانیاری پەرش و بڵاو لە سەر ئەویتریان دەبێت و ئەویتریشیان زانیاری لە سەر بڵندی کێوەکان و درێژی ڕووبارەکان و شکڵ و ژمارەی شارەکان ئەبێت.

هەندێک پێیان وایە کە مێژوو تایبەت بە رابردووە و بۆ ئێستا بێسودە و لەگەڵ ڕەوتی ئەمرۆی ئێمەدا سەروکاری نییە و بە دوورە! بەڵام ئەوە بۆچوونێکی ناڕاستە و وا نییە.

مێژوو راستە لەگەڵ رابردوودا پەیوەندی هەیە، بەڵام رابردوو لەگەڵ زەمانی حاڵدا لە یەک پچڕاو نین و پەیوەندییان هەیە. مێژوو ئاوێنەی بەراوەژوو کردنی رووداوەکانی ڕابردوو و کۆن و نوێن، بەڵام رابردووی مێژوویی لە نێو رەوتی مێژووی ئێستادایە و نەخشی هەیە. ئێمە کاتێک دەتوانین ڕەوت و ڕووداو و بار و بواری ئێستای وڵاتی خۆمان بناسین و بەرجەستەی بکەین، ڕەوتی پێشهاتەکانی رابردوو بزانین و لێیان بە ئاگا بین کە بە چ ئاقار و ئاراستەیەکدا رویشتوون.

ئەگەر گرنگترین لێکۆڵینەوەکانی نیوەی دووەمی چەرخی نۆزدە ئەمە بوو بێ کە بۆ تێگەیشتن لە هەر شتێک، لە رەوتە مێژووییەکەی باش ئاشنا بن و بزانن چۆن و بە کام بوارو رەوتدا ئەتلێتەوە، کە بتوانن



کەڵکی خۆی لێ وەرگرن و بە قازانجی خۆیان بیقۆزنەوە. بەڵام بە داخەوە کۆمەڵگاکانی ئێمە و گەلی کورد بە تایبەت تا ئێستا وەک پێویست هۆکاری نەڕەخسان، بۆ خۆی بوو بێ، یان دەوروبەر و سیستەمی دەسەڵاتدار، کەڵکی پێویستی وەرنەگرتووە، لەو رەوتە مێژووییانە کەم ئەزموون بووە. نموونەی هەرە گرنگمان دوو پات بوونەوەی نەهامەتییەتاڵەکانی رابردووە کە زۆر جار ئەزموونی تاڵ سەر لە نوێ تاقی کراوەتەوە و لەو بوارانەوە نەمانتوانیوە خۆ ببوێرین.

هەڵبەت بە خۆشییەوە ئێستا کە وا خەریکی نووسینی ئەم کتێبەم کورد لە قۆناغێکی زۆر گرنگ و هەستیار و مێژووییدا تێپەڕ دەبێت، وا خەریکە لە دراوسێکانی پێشین دەگرێت و بە لە بەرچاو گرتنی رووداوەکانی رابردوو ئەزموون و کەڵکی باش وەردەگرێت و بۆ پێشەوە دەڕوات. هەرچەندە هەموو شتێک تەواو نەبووە و هێشتا زۆری ماوە، گەرچی سەرەڕای ئەو گرفت و کێشە سیاسی و ئابووری و چەند حیزبی و ئیدارییەی کە گرنگی بەرژەوەندی تاکی بە سەر کۆمەڵدا داوە، ئاستی تێگەیشتووی سەر بە خۆی فیکری و فەرهەنگی هێشتا لە چاو ویست و خواستەکاندا نزمن، بەڵام مەشخەڵی داگیرساندووە و لە پەرەسەندن و گەشەکردندایە و جێگای دڵخۆشییەکی زۆرە.

هەرچەندە تۆزێک لە باسەکەمان پەراوێزمان گرت بەڵام بێ پەیوەندی نەبوو لەگەڵ رەوتی فەرهەنگی و پەروەردە و فێرکردن و ئەزموونگەری بۆ ئێمەی کورد. باس لە سەر کورد و ئیدارەی کوردی، ئامانجی حیزبی، دژایەتی و نادیاری سنووری کوردستان و ئیداری...، پیلانی دوژمنان و دەوروبەر، لێرەدا جێگایان نییە و ناگونجێت، گەر بوار هەبێت لە کات و ساتێکیتر و لە ژێر ناوی باسێکیتردا ئەو لایەنە روون دەکەینەوە و بە تێروتەسەلی تا ئەو رادەی پێمان بکرێت و بۆمان بگونجێت و شارەزاییمان هەبێت ئەنووسین. هیوادارم نەگاتە ئەو کاتە کە تەنیا

رەخنە بگرین، بەڵکو زیاتر پەسنی کوردانە و دڵسۆزانەی تاک و کۆمەڵ لە بواری کورد و کوردستان و نیشتمان باس بکەین، تا ئەو کات ئاواتی هەموو کوردان بەدی هاتبێت. ئەمانە دیسان پەیوەندی بە  پەروەردە و فێرکردنەوە هەیە.

مرۆڤ تا رابردووی خۆی نەناسێت ناتوانێت داهاتووی باشتر و گەشاوەتر بکات. گەر وەک پێویست و روون لە ئاقارو رەوتی فێرکردندا بە شێوەیەکی زانستی لە هەر دوو بواری جوگرافیا و مێژوودا، رووداوەکان شیکار نەکرێن و منداڵانی پێ پەروەردە و فێر نەکرێن، ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو کۆمەڵگایە لەڕووی بەرفراوانکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوە کەم ئەهێنێت.



## پوختەیەک

پەیوەندی مرۆڤەکان بە یەکەوە، هۆکارێکە بۆ پرمایە بوونی ئەزموونەکان، ئەمەش کاتێک بە باشترین شێوە خۆی دەنوێنێ، چەندین وێستگە هاوبەش لە نێو خەڵکدا باڵا دەست بێت، بە جۆرێک کە رەوتی گواستنەوە و وەرگرتنی واتا و مەبەستەکان بە ویست و خواستەوە ئەنجام بدرێت.

لەم رێگەوە ئەو ئەزموونانەی کە تاک بەشێکی زۆری بەشێوەیەکی زانستییانە پێی گەیشتووە و فێری بووە، بە ئەزموونەکانی قەومێک، کۆمەڵ و کۆمەڵگایەک، یان تەنانەت بە تەواوی مرۆڤایەتییەوە گرێ ئەدات پێچەوانەکەشی بەرتەسک ئەبێتەوە و گرفت پێک دێنێت.

مێژوو و جوگرافیا گرنگترین دەرس و وانەن کە دەبنە هۆی بەربڵاوی و خەستبوونەوە و مایە زۆری ئەزموونە تاکییەکان و مرۆڤ گرێ ئەدات بە سروشتی پان و بەرین، و رابردووی مرۆڤایەتی. بە داخەوە ناڕوونی ئەو بەشانە بە تایبەتی بۆ کورد کە کێشەی مێژوو و جوگرافیای کوردستانە لێی بە ئاگا نییە و بە تەواوی رابردوو و سنووری خۆی ناناسێت، تا هەنووکەش تاکی کورد ئاگای لە شوێن و ژینگە و سروشت و شوێنەوار و سنوور و بە گشتی رابردووی نییە.!

نموونەی زیندوو؛ کە لە هەر تاکێکی ئەورووپی پرسیاری مێژوو و سروشت و ژینگەی دەکەی، تەنانەت لە وانەش سەرخۆش یان شێتیشن، بۆت دەستنیشان دەکەن و زۆریش پارێزگاری و رێزی لێ دەگرن.

هەر گەلێک لە دونیایدا کە دەیەوێ  بوونی هەبێت دەبێ چاک لە رابردوو ئاگادار بێتو ئاو و خاک و وڵاتی خۆی بناسێت، بیپارێزێتو بە نەوەی نوێی فێربکات.  دەیڵێمەوە، کە لەنگیمان لەم رووەوە نەبوونی دەرفەتی ئازادی لە لایەکو لایەکانیتریشی سیستەمی سەقەتی پەروەردەیی بووە.

زانستی ئەو دوو بەشە گرنگە، "مێژوو، جوگرافیا" کە ئاماژەمان پێدا، زۆر نووسراوە و کتێب و باس لە سەریان کراوە و دەیان و بگرە سەدان پسپۆڕ و شارەزا لێی دواون، ژیانی کۆمەڵگا لە گۆڕەپانی سروشتدا ئەخاتە ژێر باس و پرسیار.

یەکەمیان؛ لە سەر بە کۆمەڵ ژیان و ڕەوت و ژیانی کۆمەڵایەتی، دووەمیان؛ لایەنی سروشتی ئەسەلمێنێت و لە سەری ئەدوێت. ئەم دوانە پێکەوە بەستراونەتەوە و دەبێ پێکەوەش بووترێنەوە.

– لێرەدا پێم باشە تۆزێک بە گرنگی زانستدا بچینەوە و کورتەیەکی لێ باس بکەین: " زانست ئەو زانیارییانەیە کە لە سەر بنەمای بینین، تاقیکاری، فیکر، نەزم و هۆشیاری خۆی دەنوێنێ. تەواوترینی، جۆری زانستە و یاسایەکی مەنتقی هەیە، واتە؛ وتنەوە و خوێندنەوە. بیرۆکەی زانست لە بنەمای یاسایەکی وتنەوە سەرچاوە ئەگرێت." بەم پێناسەیە ناتوانرێ بە پێی بارودۆخی ئەو وتنەوە، زانست فێری منداڵ بکرێ. ڕەوشێک کە بۆ ئەم مەبەستە شایستەیە، "ڕەوشی دەروونناسی‌یە"، ئەم ڕەوشە وا خۆی ئەنوێنێ کە زانست تێکەڵ بە تێکۆشانەکانی منداڵ ئەبێت و ئاوێتە ئەبن. بێجگە لەوەش کە مەنتقی زانست بۆ منداڵ جۆراوجۆرە، منداڵانێش لەو بوارەوە تەنیا مشتێک بنەما و فۆرمی ناڕوون و وشک، قورس و گران، گێژکەر و بێ سوود فێر دەبن.

زانست بە درێژایی مێژوو مرۆڤی لە ژێر چنگی داب و نەریت و سوننەت رزگاری کردووە، هەروەها مرۆڤی لەڕووی ئامراز و ئامانجگەلی ژیان دەوڵەمەند کردووە. وانە زانستییەکان لە فێرگەکاندا دەبێ بە شێوەیەکی وا بووترێنەوە کە منداڵان بخاتە بیر و هزری زانستی و خووی پێوە بگرێت و ببنە هاوڕێ. بەم جۆرە بەرەو پێش چوونی کۆمەڵگا خێرا دەبێت و گەشە دەکات.



## بەشی هەشتەم:

**١- لێکدانەوە و چاوگێڕانێک بە بەشەکانی پێشووتر:**

تا ئێستا زیاتر باسمان لە سەر بنەمای پەروەردەو فێرکردن و پێویستییەکانی کردووە، بەڵام بە هیچ جۆرە هەوڵێکمان بۆ پێناسە و باس لە خودی بنەما و پێناسەی "فەلسەفەی" ئەو بەشەدا نەداوە. لەم ڕووە بە چاوخشانێک بە نێو باسە فەلسەفییەکانی پێشوو گرنگی بنەما و فەلسەفی دەردەکەوێت.

بە گشتی، تا ئێرە باسەکان دەکەینە سێ بەش:

**بەشی یەکەم؛** بریتین لە بوارەکانی کۆمەڵایەتی، فێر کردن و پەروەردە. دەرکەوتووە کە ڕەوتی گشتی فێرکردن و پەروەردە بە هۆی ئاڵوگۆڕکردن و بڵاوکردنەوەی سودو سەرمایەی کەلتووری دێتە کایەوە.

هەر نەوە و نەتیجەیەک لە دوو ڕێگەوە ئەتوانن پاشماوە و میراتی پێشینان بە دەست بێنن: یەکیان لە ڕێگەی فێربوونی ڕێوڕەسمی ژیان و ڕەوتی کۆمەڵایەتی لە کاتی بەشداریکردن لە یاریو کاردا، ئەویتریان لە ڕێگای فێرکردنێک کە بە مەبەستو پێداگرتن دێتە کایەوە. بۆ نموونە، وتمان کە جێبەجێ کردنی میراتو پاشماوەی فەرهەنگی کۆمەڵگایەک لە نێو کۆمەڵگاکاندا بە شێوەی ئامێری و ڕەمەکی دانراوە. ئەو جۆرە کۆمەڵگایانەی کە بە دەستی چینی باڵادەست ئیدارە ئەکران، بە داب و نەریت و سوننەت پابەند بوون، بەم بۆنەوە لادان لەو خەت و ڕێبازە و بازدان لە پاشماوە و میراتی نەژادییان بە ڕەوا نەدەزانی و بۆیان نەبوو کە لابدەن. بەڵام کۆمەڵگاکانی سەردەمەکەم و زۆر لە میحوەرو بازنەی

ديموكراسيدا ئەسورێنەوە و دانيشتوانيان ئەتوانن لەو چوارچێوە سوننەتييە ئەستەمە بێنە دەرێ و بە بير و هزرى تايبەتى خۆيان ميرات و بەجێماوەى پێشينانيان دەوڵەمەنتر بكەن.

**بەشی دووەم؛** لە بەشەکانی شەشەم و حەفتەمدا پەروەردە و فێرکردنێک کە بە کەڵکی کۆمەڵگای دیمۆکراتی بێت، شی کراوەتەوە. زانیمان کە ئەمجۆرە پەروەردەییە چەمک و بواری بەرفراوانی دەوێ و کاتی پێویستە تا مرۆڤ بتوانێ دەست بداتە ئەزموونی نوێ و سەرلەنوێ ڕێکخستن و نوێکاری، یاسای نوێ بخاتە نێو تاقیکردنەوەکانیان و لەڕووی مەبەستیشەوە ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی زیاتر جێی باوەڕ بێ.

دواتر بگەڕێینەوە بۆ بەشی سێیەم؛ باسەکان ڕۆیشت بەرەو سیستەمی پەروەردەیی لە نێو کۆمەڵگا دیمۆکراتییەکاندا، کە هێشتا کەموکۆڕی دەبینرێن.

هەوڵماندا تا بەربەستەکانی پەروەردەیی پێشڕەو بناسین، بۆمان دەرکەوت کە گرفتەکان لەم ئاستانەدا لە کۆمەڵگاوە سەر هەڵدەدەن و دێنە کایەوە. لە زۆربەی کۆمەڵگاکاندا دوو بەشی "زۆرینە و کەمینە" بەرچاو دەکەون، زۆرینە هەوڵ ئەدەن بە کار و ڕەنج و ماندوو بوونیان ئامێری بەرجەستە کردنی پێویستییەکانی کۆمەڵگا دروست بکەن، کەمینەش دەستی ڕەنجو بەرهەمی زۆرینە ئەخەنە ژێر چنگی خۆیان و ژیانی خۆیان بە فرت و فێڵ و خۆ نەڕەنجان تێپەڕ ئەکەن، لێرەدا زۆرینە و جۆری ژیانیان، ڕەنج و مەینەتییان، بە زەبوونی و ژێردەستەیی دەزانن. ئەم دوو جەمسەرە دژ بەیەکەی نێو کۆمەڵگا دەبێتە هۆی ئەوەی کە پەروەردە و فێرکردن و بەشەکانیتری فەرهەنگی و کولتووری ببنە فیدای زەنجیرەیەک کێشە و دژایەتی، وەک: دژبەری " زەین و لەش،



تاک و جیهان، یاری و کار، تەقەلای نەزەری و مەیدانی، تاک و کۆ، کەسایەتی و پیشەیی واتە کەسێکی دەسەڵاتداری نێو کۆمەڵ و کەسێکی خاوەن پیشە و هونەر..." ئەو جۆرانە و دەیان جۆری دیکەش وامان لێدەکات کە بە شوێن بنەما و بناغەی ئەو ناکۆکییانە بگەڕێین و بوارێکی وا پێک بێت کە یەکسانی و تەبایی بێنێتە کایەوە، ئەویش بە ئاگا هێنانەوەی کۆمەڵ و کۆمەڵگا و هۆشیار کردنەوەی تاک و کۆ لە ناو فێرگەکاندا.

**٢- ناوەڕۆکی فەلسەفە:**

تا ئێستا فێر بووین کە باسی فەلسەفەی فێرکردن و پەروەردە، باسێکن وەک؛ پەیوەندی زەین و مادە، جەستە و ڕۆح، مرۆڤ و سروشت، تاک و کۆ، نەزەری و مەیدانی، کە تێکڵاو و ئاوێتەی ژیانی کۆمەڵایەتییە و ئێستاش کاتی ئەوەیە لە هاتنە ناوەوەی باس و بینینی فەلسەفە و پەیوەندییان بە پەروەردە و فێرکردنەوە باس بکەین.

لە ژیانی تاکی کۆمەڵگادا ڕەوتگەلێکی هەمە ڕەنگی فراوان و فەرمانڕەوایە. بۆ نموونە، لەم ڕەوتەی ژیاندا و لە ناو کۆمەڵگادا هەندێک جیاوازی هەیە کە دەتوانین بڵێین بواری پێکەوە گونجانیان نییە، وەک؛ دین و زانست، تەقەلای ئابووری و هونەری، کۆنەپەرەستی‌و نوێخوازی، کە بە گشتی لە تاک و کۆدا دژایەتی بوونی هەیە. کەسێک کە بتوانێت لە نێو ناسازگاری و ئەو پێکەوە نەگونجان و دژایەتییانەدا کە لە نێو ژینگەی خۆیدا هەن بژی، دەبێ بە جۆرێک لە جۆرەکان ڕێکخستنێک و تێکەڵییەک لە نێوان ئەو کێشانەدا بە دروست بکات و تەکلیفی خۆی بەگوێرەی ئەو دیاردانە دەربخات. لێرەدا فەلسەفە وەڵامدەری ئەو جۆرە پێداویستییانە، هەر کەس بە پێی ویستەکانی خۆی و ئەزموونەکانی، فەلسەفە و

بنەمایەک بۆ خۆی پێکدێنێ، هەرچەندە ئەم جۆرانە تاکین و هەموو لایەکانی ناو کۆمەڵگا و ئەندامانی ناگرێتەوە.

– فەلسەفە بە واتای دروستی وشە هەوڵێکە بۆ تێگەیشتنی ڕاستییە پەرش و بڵاوەکانی سروشت و کۆمەڵگا و لە بنچ و بنەما و ناوەڕۆکی شتەکان ئەگەڕێ. لێرەدا چەند خاڵێک دەسنیشان ئەکەین:

أ– فەلسەفە گشتگرە، بەڵام نەک لە هەموو کون و کەلەبەرێکی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان، تەنیا لەو بوارانەی کە بە کەڵکن بەڵام نائاشکران. فەلسەفەش وەک باقی بوارەکانی ژیانی مرۆڤ و شتەکانیتر بەردەوام لە گۆڕاندایە. لەگەڵ شتێکی چەسپاو ڕوون سەروکاری نییە و خۆ دەبوێرێ و بە دوای شتی نادیار و ناڕووندا و بە شوێن بنەمای هۆکارەکاندا ئەگەڕێت. لەم ڕووەوە ڕەوتی فەلسەفە وەک بیرکردنەوەیە، وەک چۆن بیرکردنەوە ڕەوتێکە بەرەو هۆکارە ناڕوونەکان و ئەیەوێ بەسەریاندا زاڵ بێت، فەلسەفەش ئاوا پێکهاتەی کۆشش و تاقیکاریە و بەردەوام بەرەو خوڵقاندنی شتی نوێ دەڕوات.

ب– فەلسەفە زەمانەتی ئەو وەڵامانەیە کە کۆمەڵگا خوازیاریەتی. گەرچی زۆرێک لە فەیلەسووفان لە واقعی سروشتی و ژیانی کۆمەڵایەتی مەودا و دووری دەگرن و باس و وتار و تێڕوانینەکانیان لە خام و دەرککردن و زمانی ئاسایی بە دوورن، بەو حاڵەش هەر فەیلەسووفێک تاڕادەیەک لە پەیجۆری خواستەکانی کۆمەڵگایە و بە دوای چارەسەر کردنیانەوەن. لەم ڕووەوە کەم و زۆر چوونەتە ناو کۆمەڵگاوە و گرێ کۆڵەکانیان کردووەتەوە و لە ڕێ‌و ڕەسمی، ژیاندا گۆڕانێکیان پێکهێناوە و پێک دێنن.

سەدەکانی ناوەڕاست شایەتی پەیوەندی فەلسەفە بە دین‌و حکوومەت ئەدەن. هەر کۆمەڵگایەک لە نێوان ڕەوتی ژیانیدا تووشی هەورازو نشێوی زۆر دەبێت، بۆ چارەسەری ئەو گرفت و بەربەستانە، ئاڵوگۆڕ و



گۆڕان بە پێویست ئەزانێت. فەلسەفە ئەوانە ئەخاتە ئەستۆی خۆی‌و چارەسەرییان بۆ ئەبینێتەوە. لەم ڕووەوە ئەتوانین بڵێین؛ فەلسەفە بەرنامەی گۆڕانی کۆمەڵگایە.

هەرچەندە ئەم باسەی دوایی لە سەر فەلسەفە و فەیلەسووف باسێکی گرانە و دەبێ کەسانیتر و شارەزایانی ئەو بوارانە لێی بدوێن، بەڵام بە پێویستی ئەزانم بیرتان بێنمەوە کە ئەم باسانەی لەم کتێبەدا هاتوون تێکڵاوێکن لەو سەرچاوانەی کە فەلسەفیانە لە سەر پەروەردە و فێرکردن نووسراون و هاتوونەتە کایەوە. سەرچاوەی هەرە گرنگیان کتێبی پەروەردە و فێرکردنی "**جان دەیوید**" ە، کە تەواوکەری باسەکانیترن.

لێرەدا دەتوانم ئەوە بڵێم؛ ئەو چین و توێژ و کۆمەڵەی کە لە بواری کۆمەڵایەتی و سروشتەوە فەیلەسووف و فەلسەفەی لێ پەیدا بوون و سەریان هەڵداوە، زووتر گەشەیان کردووە و بوون بە جێگای شایان و شانازی، ئەو کۆمەڵگا ڕێگەی ڕاستەقینەی ژیانی گرتۆتەوە پێش و پێشڕەویان گرتووە.

ئەگەر بڵێم گەلی ئێمە و ناوچەکەمان لەم بوارانەدا بەداخەوە لاواز و نەدارو بێ فەیلەسووف بووە، بە هەڵەدا نەڕۆیشتووم. نموونەکانی ئەو دیاردانەن کە ئێستاش بە دەستیانەوە ئەناڵێنین، کە چۆن پەروەردە و فێر نەکراوین رابردووی خۆمان و دەوروبەرمان بناسین و لە خورافاتو ڕاستی‌و ناڕاستی تێبگەین و بۆ یەکجاری لە دەس نەزانی و خەوی ناهۆشیاری رزگار بین. ڕاستە هەموو کۆمەڵگایەک و کۆمەڵێک خاوەن زانای زۆر بەرزو فەیلەسووف نەبووە، بەڵام کەڵک وەرگرتن لە بیر و بۆچوون و ڕوانگەی زانا و داهێنەران هەمان دەرەنجامی باشی هەبووە. ئێمەش دەتوانین کەڵکیان لێوەرگرین و لە پەنایانا بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵەکەمان سوودیان لێ

ببینین. لەبەر ئەوەی لە ناو هەر کۆمەڵگایەکدا دەستە و تاقمی جۆراوجۆر هەن و هەر لایەنێکیان لەگەڵ قازانجو بەرژەوەندی تایبەتی و دیاریکراو پێکەوە سەرگەرمن، کەوابوو هەریەکێکیان یاسا و دیسیپلینی فەلسەفی هەمە بابەت دێننە بوون.

بۆ نموونە؛ تویژی فەرمانڕەوای کۆمەڵگایەک کە لە ناو خێر و خۆشیدایە ناتوانێت لە روانگەی چینی رەنجبەرەوە بڕوانێتە جیهان و کۆمەڵگا و ئەو فەلسەفەیە قەبووڵ بکات.

رەهەند و رەوتی کۆمەڵگا یەکسان نین، لێرەوە ناتوانین چاوەڕوانی ئەوەمان هەبێت کە بۆ نموونە: فەلسەفەی کۆمەڵێکی پیشەیی کە لە سەر مەدار و بازنەی کڕینو فرۆشتن و بازرگانی دەگەڕێت، لەگەڵ کۆمەڵێک کە هۆگری زەوق و هونەرە، لە یەک بنچینە و یەکسان بێت.!

هەروەها ناتوانین ئەوەشمان قەبووڵ بێت کە کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوو و بە ئەزموون لەگەڵ کۆمەڵگایەکی نوێ و کەم ئەزموون بخەینە قاڵبێکەوە، ئەم دوانە لهڕووی بیرو بۆچوون و تێگەیشتن لە گرفت و گۆڕانکاری فەلسەفەی هاوبەش پێک ناهێنن.

د- فەلسەفە و پەروەردە و فێر کردن لێک گرێدراون، وەک چۆن زانیمان فەلسەفە بەرنامەی گۆڕانی کۆمەلگایە، ناشبێت کە گۆڕانی کۆمەڵگا تەنیا ببەستینەوە بە بواری پەروەردە و فێرکردن. بەمجۆرە دەتوانین بڵێین کە فەلسەفە بە گشتی، بنەمای تێڕوانینی پەروەردەو فێر کردنە و ئەوەش تاقیکارییەکە، کە بیروڕای فەلسەفە دەخاتە ژێر ئەزموون و تاقیکاری. لە مێژووی فەلسەفەی ئەوروپاییدا بە تەواوی دەردەکەوێ کە فەلسەفە و پەروەردە و فێرکردن لە دێرزەمانەوە پەیوەست دراون بە یەکەوە و بوون بە هەڤاڵ و دۆستی یەکتر و لە یەک دانەبڕاون.



لە بەشەکانی پێشوودا چەندین ئاماژە و نموونەمان لە فەیلەسووفان و ڕوانگەکانیان لەو بوارەدا باس کردووە و لێرەدا دووپات کردنەوەیان بە پێویست نازانین، تەنیا دەتوانین بڵێین کە فەیلەسووفە **یۆنانییەکان** بە تایبەت "**سوفستایی**" یەکان یەکەمین راهێنەرو ڕێپیشاندەرانی ئەوروپا بوون و هەر لە سەرەتاوە فەلسەفەیان تێکەڵاوی پەروەردەو فێر کردن کردووە و هاوکاری و هەماهەنگییان کردووە، بۆیە لێرە واتە ئەوروپا کە باس لە فەلسەفە و فەیلەسووف ئەکەن زۆر زوو بە ئاسانی تێی دەگەن و بە لایانەوە شتێکی نامۆ و تازە نییە، هەروەها لە روانگەی هەر تاکێکی ناو ئەو کۆمەڵگایە تێگەیشتن و دەرک کردنی باسی فەلسەفی سەخت و دژوار نییە و بە باشی و بە ئاسانی تێی دەگەن. بەڵام لە وڵاتانی سێیەم و بە تایبەت کۆمەڵگای ئێمە کە باسی فەلسەفە و فەیلەسووف بکرێ و دەست لەو بوارانە وەردەین، خەڵک بە لایانەوە سەیرەو زۆر قورس و گران لێی تێدەگەن، ئەگەریش شتێکی سانا و بابەتییانە باس بکرێت بە ناوی فەلسەفە، بێ یەک و دوو پەراوێز دەگرن و خۆیان لە قەرەی نادەن و هەر لە دوورەوە دەڵێن ئەوە گرانەو لێی حاڵی نابین!.

وەک باس کرا فەلسەفە واتە: بنەما، بناغە، ریشە، ئاشکرا کردنی نادیار و ناڕوونەکان، تێگەیشتن و خوڵقان، پێکهێنان، دۆزینەوە...

فەلسەفە لە بواری پێکهاتەی سروشت و مرۆڤ بە دوای پرسیار و وەڵامی زۆردا بووە و لە دەورانی "**سوفیستایی**"یەکان هاتە کایەوە. کە لەوێدا- لاوانیان فێری کردار و هونەر، ماڵداری و رامیاری و وڵاتپارێزی کرد. باسەکان بەم ئاراستەیدا بوون؛ " پەیوەندی مرۆڤ و سروشت، تاک و جیهان، سونەت و هۆش، زانست و کرداری.." وتیان : پلەبەرزی لە ریگای خوێندنە یان سوننەتی و سروشتی؟ هەروا درێژەی کێشا و بەرەو شتیتر چوو؛ فێربوون چییە؟ زانست چییە و چۆن بە دەست دێت؟ بە ئارەزووە یان وزەیتر؟ نەزان چۆن زانا دەبێت؟ گۆڕان

و ئاڵوگۆڕ و گەشە کردن و پێشکەوتن چین و چۆن دێنە کایەوە؟ تیۆری و پراکتیکی چ نیسبەتێکیان هەیە و کامەیان گرنگترە؟... هتد. بەم شێوە روون دەبێتەوە کە لە سەرەتا یەکبوونێکی قووڵ لە نێوان فەلسەفە و پەروەردە و فێر کردندا هەبووە.

لەم سەردەمە نوێیانەدا بە هۆی ئەو گۆڕانکارییە گەورە کۆمەڵایەتییانە، وەک؛ گەشەی زانستی و شۆڕشی پیشەیی و بەرەو پێش چوونی دیموکراسی، پەیوەندی تۆڕی ئینتەرنێتی و بچووک بوونەوەی جیهان لەڕووی پەیوەندی کردن‌و بە ئاگا بوون لەڕێگای مانگە دەسکردەکان، لە چرکەیەکدا حاڵی بوون و بینینی هەر رووداو و کارەسات و هەواڵ و پەیامێک کە لە هەر گۆشە و قوژبنێکی دووری ئەم گەردوونە باس دەکرێت و روو دەدات و دێتە کایەوە، لە ئان و ساتێکدا بڵاو دەبێتەوە و کۆمەڵگای بەشەری لێی ئاگادار دەبن.! ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە مرۆڤ دەبێ زۆر زوو لە هەموان حاڵی بێت و لێکدانەوەی هەبێت و بیانخاتە خانەی تێگەیشتنەوە.

بۆ ئەوەی لەو هەمە لایەنە گشتگیرە و هەمە جۆرە و هەمە بابەتییانە حاڵی بین و کەڵکی لێ وەرگرین، گۆڕانی پەروەردە و فێر کردنیش پێویستی زیاتری ئەبێت، دەنا لە هەموو ئەو شتانە دوا دەکەوین و لە رەوتی کۆمەڵگای سەردەمیش بە جێ دەمێنین.

لەوانەیە بڵێین کە ئەم چەرخەی ئەمڕۆ هەمووی لە ژێر زەڕەبینی مانگە دەسکرد و پردە تۆڕییەکانەوە تێپەڕ دەبن‌و تەنانەت لەوانەیە بە قەدەر نوکی دەرزیش تێدا ون نەبێت، بەڵام هێشتا پەروەردە و فێر کردنی سەردەمییانەی دەوێ تا لەو هەموو شتە سەیرو ئاڵۆزانە تێبگەن. تەنیا رێبازی پەروەردە و فێرکردنی سەردەم دەتوانێ هاندەر بێت کە لەو بە خێرا رۆیشتنەی کات ون نەبین و دوا نەکەوین و کەڵکی پێویستی لێ وەرگرین.



## پوختەیەک لەم کۆتاییەدا

باسەکانی ئەم بەشەی دوایی باس لە سەر فەلسەفە بوو کە دەبێ بڵێین فەلسەفە بناغەی تێڕوانینی گۆڕانی کۆمەڵگاو پەروەردەو فێرکردنە بەگشتی. بەم شێوەیە باسەکان کورت ئەکەینەوەو کار پێکردن و هەڵسەنگاندن و درێژەی باسەکان دادەنێین بۆ خوێنەران و شارەزایانی ئەو بوارانە.

فەلسەفە جۆرێک بیرکردنەوەیە وەک باقی بیرکردنەوەکانیتر. لە نێو ئەزموونەکانی مرۆڤدا بە شوێن چەندین هۆکاری گرنگو نادیار و ناڕوونی گەردووندا دەگەڕێت بۆ دۆزینەوە و چەسپاندنیان، چەندین پلان و رێباز دەخاتە پێش دەست. هۆکارە ناڕوون و گرنگەکانی بەردەم بە شوێندا گەڕانی فەلسەفی، هەر لە ژیانی مرۆڤەوە سەرچاوەی گرتووە و لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا رەوت و رووداوی جۆراوجۆر و دژ بە یەک زۆرن، فەلسەفە هۆکار و ئامرازە، یەکەم؛ بۆ لەناوبردنی ناسازگاری و دژەکان، دووەم؛ چۆنیەتی گۆڕانی بواری کۆمەڵایەتی و لابردنی ناسازگاری و بەربەستەکان.

## کتێبە چاپکراوەکانی دەزگای موکریانی لە ساڵی ٢٠٠٦

١- دەروازەکانی کۆمەڵناسی ، ن: مەنوچێهر موحسنی ، و: کۆمەڵێك وەرگێڕ
٢- میژوویێتی هزری عەرەبیی ئیسلامی ، ن: محەمەد ئارکۆن ، و: نەریمان تالیب
٣- گوڵبژێرێك لە چیرۆکەکانی سادقی هیدایەت سادقی هیدایەت ، و: عەلی نانەوازادە
٤- چەند وێستگەیەکی ئەدەبی و فیکری ، و: ئازاد بەرزنجی
٥- خواوەند و پاڵەوانەکانی گریکلاند ، ن: ئیریك ئێریکسۆن ، و: تەها ئەمین هەڵەدنی
٦- حەکیمانە ، ن: پاولۆ کۆیلیۆ ، و: یوسف محەمەد/کارا فاتیح
٧- یەکەمین سەرچاوەکانی هونەری مۆدێرن ، ن: هـ. و. جەنسن ، و: سەیوان سەعیدیان
٨- چەند دۆکیۆمێنتێکی نێودەوڵەتی لەبارەی مافەکانی مرۆڤەوە ، و: قادر وریا
٩- دیجلەی هزرم ، ن: د. مارف خەزنەدار
١٠- ئایین و دەوڵەت و پیادەکردنی شەریعەت ، ن: د. محەمەد عابد جابری ، و: فوئاد سدیق
١١- فەلسەفەی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی ئوگوستین ، ن: د. عەلی زەیعور ، و: سنوور عەبدوڵڵا
١٢- گۆرستانی غەریبان ، ن: ئیبراهیمی یونسی ، و: غەریب پشدەری
١٣- فیهی ما فیهی ، ن: مەولەوی ، و: عەلی نانەوازادە
١٤- گوڵستان ، ن: سەعدی ، و: عەلی نانەوازادە
١٥- ئایدیای قانوون ، ن: دنیس لوید ، و: ئاسۆ کەریم و...
١٦- مرۆڤ و ئایینەکان ، ن: میشێل مالرێب ، و: هیوا مەلا عەلی سوورەدێیی
١٧- پەروەردەو پێگەیاندنی منداڵ ، ن: ئا. مکارنکۆ ، و: مستەفا غەفور
١٨- القبائل الكوردية ، ن: ويليام ايغلتون ، و: د. احمد محمود خليل
١٩- گەڕیان ل دیف بەتەوەرییێ ، ن: لورد ئاوویبۆری ، و: جگەرسۆز پێندرۆیی



٢٠- تەنگژەکانی تیرۆریزم ، ن: کۆمەڵێك نووسەر ، و: هێمن غەنی و مەروان کاکل
٢١- دوا وەسوەسەی کریست ، ن: کازانتزاکی ، و: کەریم دەشتی
٢٢- گوتاری تیرۆریزم ، ن: کۆمەڵێك نووسەر ، و: کۆمەڵێك وەرگێڕ
٢٣- ژان ، ن: مارگارێت دوراس ، و: رەسوڵ سوڵتانی
٢٤- تیرۆریزم وەك تاوانێکی ڕێکخراو ، ن: گاری پوتەر/ مایکڵ لیمەن ، و: ئەبوبەکر مەجیدی
٢٥- چەند لایەنێکی واتاسازی ، ن: کوروش سەفەوی ، و: دلێر سادق کانەبی
٢٦- هەمووو هەقیانە ، ن: مەنۆچەهری کەریم ، و: زادە غەریب پشدەری
٢٧- کاتێ نیچە گریا ، ن: ئیرڤین دی یالوم ، و: دڵشاد هیوا
٢٨- ژانی ژینگە ، ن: سەدرەدین نورەدین
٢٩- عاشقانە ، ن: پاولۆ کۆیلیۆ ، و: کارا فاتیح / یوسف محمد
٣٠- کۆمەڵگای کراوە و دوژمنەکانی (بەرگی یەکەم) ، ن: کارل پوپەر، و: ئیدریس شێخ شەرەفی
٣١- کۆمەڵگای کراوە و دوژمنەکانی (بەرگی دووەم) ، ن: کارل پوپەر ، و: ئیدریس شێخ شەرەفی.
٣٢- میسیۆ برایم و گوڵەکانی ناو قورعانەکەی ، ن: ئیریك ئیمانوئیل شمیت ، و: سەلاح گادانی
٣٣- خگوه علی الگريق الى البيت الكوردى الكبير د. حسين بديوى
٣٤- آلية العلاقة بين المعارضة والسلطة في الاسلام د. كاوة محمود شاكر
٣٥- جماليات الطبيعة في كردستان العراق د. محمد عارف
٣٦- کورد و جینۆساید و ئیبادەکردن هەژار عزیز سورمێ
٣٧- پرۆدۆن جۆرج گۆرڤیچ ئارام ئەمین
٣٨- مینۆرسکی و کورد ئەنوەری سوڵتانی
٣٩- کورد و سەلجوقییەکان د. نیشتمان بەشیر ئیدریس عەبدوڵڵا
٤٠- دە ڕۆمانی گەورەی جیهان
٤١- لە دەوڵەتی دەسەلاتەوە تا دەوڵەتی عەقڵ سیروان زەندی

٤٢- ئیبن خەلدون وکۆمەڵناسی مۆدێرن زیرەك رەحمان و...

٤٣- ئەو ئایدیایانەی دەستیان بەسەرجیهاندا گرت گۆران سەباح

٤٤- کورد لەئەرشیفی روسیاو سۆڤیەتدا د. ئەفراسیاو هەورامی

٤٥- قوتابخانە ئەدبیەکان حەمەکەریم عارف

٤٦- عاریفانە پاولۆ کۆیلۆ گارا فاتح و ...

٤٧- زمان، هزرو کولتور چەند نووسەرێك رەحیم سورخی

٤٩- توێژینەوەی تیۆری ئەدەبی راجێر وێبستەر عەبدولخاق یەعقوبی

٥٠- ماکیاڤیللی بیری رێنسانس رامین جەهانبەگلو موسلح ئیروانی

٥١- راپەرینی کوردان پ.م.ا.حەسرەتیان جەلال دەباغ

٥٢- جێگای بەتاڵی سلووچ مەحمود دەوڵەت ئابادی

٥٣- سەرکەوتنی بێ سنوور بە ٢٠ رۆژ ئانتونی رابینز هامەوون

٥٤- واتاسازی کلۆد جێرمان و ... د. یوسف شەریف سەعید

٥٥- هەواڵنووسی مۆدێرن